# تەفسیری خاڵ



بە قەلەمی

شێخ

محمّەدی خاڵ

ئەندامی کۆڕی زانیاریی عیراق



جزمی بیست‌و هەشتەم

چاپی یـــەکەم

چاپخانەی زانکۆی صلاح‌الدین

١٤٠٢ك - ١٩٨١ز

# تەفسیری خاڵ

بە قەڵەمی

## شێخ

## محمدی خاڵ

ئەندامی كۆڕی زانیاری عێراق

**جزمی هەشتەم**

چاپی یـــەکەم

چاپخانەی زانکۆی صلاح‌الدین

١٤٠٢ك ـ ١٩٨١ز

## جزمی بیست و هەشتەم

### سوورەی « مجادلە »یە

مەدەنی‌یە ، ٢٢ ئایەتە ، ٤٧٣ ووتەیە ، ١٧٧٢ پیتە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سورەتەکانی ئەم جزمە هەموو مەدەنیـین ، واتە دوای کۆچکردن بۆ مەدینە هاتوونەتە خوارەوە ، لەبەرئەوە باسەکانی ، یادانان «تشریع» ی یاسـان ، یـا رێکخستنی کۆمەڵایەتیین •

ئەگێڕنەوە ، کە «خەولە»ی کچی «سوعلەبە» ، ژنی «ئەوس»ی کوڕی «صامت» بووە ، ئەوس پیاوێکی تووڕە بووە ، ڕۆژێ لە ژنەکەی تووڕە ئەبێ ، وە پێی ئەڵێ : تۆ وەك پشتی دایـکم وایت ، کە لە پێش ئیسـلامەتی‌دا بەمـە ، تەڵاقی پێ‌نەکەوتووە ، بـەڵام ژنـی پێ‌قەدەغە بووە لە مێردی ، کە ئەمە یەکێکـە لەو ستەمانەی کە لە ژن کراوە ، چونکە نە تەڵاقی کەوتووە تا بچێ بۆ خۆی شوو بکات ، وە نە بۆ مێردەکەشی دروست بووە کە بچێتە لای ، وە ئەمە پێی‌ووتراوە «ظهار»• ژنەکە زۆر خەفەتبار ئەبێ ، هەروەك مێردەکەشی پەشیمان ئەبێتەوە •

لەبەرئەوەی کە ئەمە یەکەم ظهار بووە لە ئیسلاما ، نەیانزانیوە حوکمەکەی چۆنە لەبـەر ئەوە ، ژنـەکە ئەچێتە خزمـەت پێغەمبـەر ، وە داسـتانەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە ، پێغەمبەر پێی ئەڵێ : لەم ڕووەوە هیچ سرووشێکم بۆ نەهاتووە بەڵام تۆ لەسەر دەستووری جاران لە مێردەکەت قەدەغە ئەبییت ، ژنەکە ئەڵێ بۆچی ؟ خۆ تەڵاقی نەداووم ، دوو سێ جار ژنەکە ئەم قسەیە ئەڵێتەوە ، پێغەمبەر هەر وەرامەکەی پێشووی ئەداتەوە ، ئنجا ئەویش سەر بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسـمان ، ئەڵێ : خوایە من سکاڵا ئەهێنمە بەر تۆ ، بۆ هەژاریی‌و بێ‌کەسیی خۆم،ئەم مێردەم ، بە گەنجیی مارەی کردووم ، کە ماڵی زۆرو کەس‌وکاری زۆرم بوو ، کاتێك کـە گەنجییم نەماو ماڵەکـەی خواردم‌و کەس‌وکـارەکەم بڵاوبوونەوە ، ئنجـا بەرەڵلام ئەکات ، ئێستاش چەنـد منداڵێکم لێ‌ی هەیە ، ئەگەر ئەیاندەمەوە بـە باوکیان ، ئەفەوتێن ، وە ئەگـەر ئەیانگرمە لای خۆم ئەمرن لەبرسانا ، ژنەکە لـەم قسانەدا

سورة المجادلة

بسم الله الرحمن الرحيم

قَدْ سَمِعَ اللهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللهِ ، وَاللهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ (١) الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَاهُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ ، إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلاَّ اللاَّئِي وَلَدْنَهُمْ ،

**سوورەی « مجادلە »یە**

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**بێگومان خوا قسەی ئەو ژنەی بیست کە دەمقالێیت لەگەڵ ئەکات دەربارەی مێردەکەی ، وە سکاڵای خۆی ئەباتە بەر خوا ، وە خوا گوفتوگۆی ئێوەی ئەبیست ، بەڕاستی خوا ژنەوای بینایە(١) ئەوانەتان کە ظهار ئەکەن لەگەڵ ژنەکانیان (وە پێیان ئەڵێن : ئێوە دایکمانن) ئەوانە دایکی ئەوان نین ، دایکی ئەوان هەر ئەو ژنانەن کە ئەوانیان بووە ،**

---

ئەبێ ، پێغەمبەر «درودی خوای لێبێ» ئەحواڵی سروشی بەسەرا دێ ، لەپاشا کە سەر بەرز ئەکاتەوە ، ئەفەرموێ : خەولە : خوا لە بارەی خۆتو مێردەکەتەوە ، ئەم چوار ئایەتەی ناردە خوارەوە ، ئەفەرموێ (قد سمع الله) بە ڕاستی خوا بیستی (قول التی تجادلك في زوجها) قسەی ئەو ژنەی کە لەبابەت مێردەکەیەوە گوفت و گۆی لەگەڵ ئەکردی (وتشتکی الی الله) وە سکاڵای خۆی ئەبردە بەر خوا ( والله یسمع تحاور کما ) خوا گوێی لە گوفت و گۆی هەردو لایەکتانە (ان الله سمیع بصیر ) خوا ژنەوای بینایە .

ئنجا باسی ظهار ئەکاتو ڕوونی ئەکاتەوە ، وە نیشان ئەدا ، کە ئەمە شتێکی ناشیرینە ، لەپیاوی ژیر ناوەشێتەوە ، ئەفەرموێ (الذین یظاهرون منکم من نسائهم) ئەوانەتان کە ظهار ئەکەن لەگەڵ ژنەکانیان ، وە پێیانئەڵێن : پشتت وەك پشتی دایکم وایە ، درۆیەکی زل ئەکەن ، چونکە ( ماهن امهاتهم ) ئەو ژنانە دایکی ئەوان نین ، تا لێیان قەدەغە ببن ، واتە بە ووتنی ئەم قسەیە ژنی یەکێك نابێ بە دایکی ، بەڵکو (ان امهاتهم) دایکی ئەوان هیچ کەسێك نییە ( الا اللائی ولدنهم)

وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَرًا مِنَ الْقَوْلِ وَزُورًا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ (٢) وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٣)

---

وە ئەوانە ( ی کە وا ئەڵێن ) قسەیەکی ناپەسەندی درۆ ئەکەن ، وە بێگومان خوا لێخۆشبووی بووردەیە(٢) ئەوانەی ظهار ئەکەن لەگەڵ ژنەکانیان لەپاشا ئەگەڕێنەوە لەوەی کە ووتوویانە ، پێویستە بەندەیەك ئازادبکەن لە پێش ئەوەی بەیەك بگەن ، بەم کەفارەتەی (کە لەسەرتان دانراوە) پەندتان پێ دائەدرێ ، وە خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن(٣)

---

تەنیا ئەو ژنانە نەبێ کە ئەوانیان بووە (وانهم لیقولون منکرا من القول وزورا) وە ئەوان قسەیەکی ناپەسەندی درۆ ئەکەن کەوا ئەڵێن (وان الله لعفو غفور) وە خوا لێخۆشبووی بووردەیە ، کەوا بە کەفارەت لەم گوناهەتان خۆش تەبێ •

ئنجا باسی کەفارەتو حوکمە شەرعی‌یەکە ئەکات ، ئەفەرموێ ( والذین یظاهرون من نسائهم) ئەوانەی کە ظهار ئەکەن لەگەڵ ژنەکانیان ، وە پێیان‌ئەڵێن : تۆ دایکمی ، یا وەك دایکم وایت ، یا پشتت وەك پشتی دایکم وایە ، واتە چەندە ئەچمە لای دایکم هەر ئەوەندەش دێمە لای تۆ جارێکی‌تر (ثم یعودون لما قالوا) لەپاشا پەشیمان ئەبنەوە لەوەی کە ووتوویانە ، وە ئەیانەوێ بچنەوە لای ژنەکانیان ، وە ژیانی ژنو مێردیی بەسەر بگرنەوە • ئنجا ئەگەر ئەمە وابوو ، با کەفارەتی ئەو کەڵەپەترەی کە کردوویانە بیدەن ، پێش ئەوەی بە یەك بگەن ، کە ئەوەش یەکێکە لەم سیانە ، بەرپیز ،واتە ، تایەکەم بگونجێ نابێ بچێ بۆ دووهەم ، وەتا دووهەم بگونجێ نابێ بچێ بۆ سێهەم ، وەکو ئەفەرموێ :

١ ـ (فتحریر رقبة) پێویستە لەسەر ئەو کەسانە ئازاد کردنی بەندەیەك ، نێربێ یامێ ، گەورە بێ‌یابچووك ،مسڵمان‌بێ یاخاوەن نامەیەك‌بێ کەسەرانەبدا (من قبل ان یتماسا) لە پێش ئەوەی ئەو ژنو مێردە بچنە لای یەك ، ئنجا باسی هۆی ئەم حوکمە ئەکات ئەفەرموێ (ذلکم توعظون به) بەم کەفارەتەی کە لەسەر تان دانراوە ، پەندتان پێ دائەدرێ ، واتە بۆ ئەوەیە کەجارێکی تر نەچنەوە سەر ئەو قسە ناپەسەندەی کە کردووتانە (والله بما تعملون خبیر) وە خوا ئاگادارە بە وەی کە ئەیکەن •

فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا. فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً. ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ. وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ. وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤)

**ئنجا ئەگەر یەکێك نەیبوو با دوو مانگ بەڕۆژووبێ لەسەر یەك پێش ئەوەی بچنە لای یەك ، ئنجا ئەگەر یەکێك نەیتوانی با نانی شەست هەژار بدا ، ئەو ( کەفارەتەتان لەسەر دانرا ) تا فەرمانبەری خواو پێغەمبەری خوابن ، وە ئەوانە سنوورانی خوان ، وە بۆ بێ بڕوایان هەیە سزای بەسۆێ (٤)**

**٢ ـ (فمن لم يجد) ئنجا ئەگەر یەکێك بەندەی دەست نەئەکەوت ئیتر لە بەر هەژاریی بێ ، یا بەهۆی نەبوونی بەندەوەبێ وەك ئێستا کە بەندە نەماوە (فصيام شهرين متتابعين ) ئەبێ دوومانگ لەسەریەك بەڕۆژووبێ بەبێ‌پشوو ( من قبل ان يتماسا ) پێش ئەوەی بچنە لای یەك ٠**

**٣ ـ (فمن لم يستطع) ئنجا ئەگەر یەکێك نەیتوانی بەوڕەنگە بەڕۆژووبێ،لەبەر پیریی ، یانەخۆشیی ، یاهەر شتێکی تر ( فاطعام ستين مسكينا ) ئەبێ خواردمەنی شەست هەژار بدات (ذلك) ئەوەی کە باس‌کرا لـە پێویستی کەفارەت لە سەرتان ( لتوءمنوا بالله ورسوله ) بۆ ئەوەی دەستووری پێشووتان بگۆڕن ، وە بە تەواویی فەرمانبەری خواو پێغەمبەری خوابن ، بەجـۆرێکی وا کـە لە هەمـوو گوفتـارو کردارێکتانا پەیوەندی ئەو بڕوایەبن ، وە لەچوارچێوەی نەچینە دەرەوە ( وتلك حدودالله ) وە ئـەوانە سـنوورانی خـوان ، بۆی داناوون ، تا لـێی دەرنەچـن ( وللكافرين عذاب اليم ) وەبۆ بێ‌بڕ وایان هەیەسزای پڕ لەدەرد ٠**

**پێغەمبەر کە ئەم ئایەتانەی بۆ خەولە خوێندەوە ئنجا پێی فەرموو : بچـۆ بە مێردەکەت بڵێ کە بەندەیەك ئازاد بکات ، خەولـە ووتی : نیەتی کـەبەندە ئازاد بکات ٠ فەرمووی با دوومانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بێ ٠ ووتی : بەخـوا پییرە ناتوانێ بە ڕۆژووبێ ٠ فەرمووی با شەست هەژار تێر بکات لەخورما ٠ ووتی بەخوا ئەمەشی نیە ٠ پێغەمبەر فەرمووی : من نیبوەی خورماکەی بۆ ئـەدەم ، خەولەش ووتی : کەواتە منیش نیوەکەی تری بۆ ئەدەم ، پێغەمبەر فەرمـووی : زۆر باشە دە بچۆ لە جیاتی مێردەکەت کەفارەتەکەی بۆ بدە ٠**

**لە تەفسیری ابن كثيرا ئەفەرموێ ڕۆژێ عومـەری کـوڕی خەتتاب لەگـەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەر ئەچێ بۆ شوێنێك ، پیرێژنێك بانگی ئەکات ،**

... نَّذِينَ يُحَادُّونَ اللهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ . وَقَدْ أَنْزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ .

---

ئەوانەی پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ئەکەن سەرەنگرێ بن ، هەر وەك ئەوانەی پێش ئەمان سەرەنگرێ کران ، ( چۆن لا ئەدەن لە فەرمانی خواو پێغەمبەر ، لە کاتێکا کە ) بە ڕاستیی ئایەتانی ڕۆشنمان ناردۆتە خوارەوە ،

---

عومەر هاوڕێکانی بەجێدێلێ ، وە ئەچێتە بەردەمی ژنەکە ، ئەوێستێ تا قسەکانی تەواو ئەکاتو وەرامی ئەداتەوە ، ئنجا دێتەوە لای هاوڕێکانی ، یەکێکیان پێی ئەڵێ : قوربان ئەم هەموو پیاوانەت لێرە ڕاگرت بۆ ژنێك ! ئەویش ئەفەرموێ : ئەوە ئەڵێیت چی ! نەتزانی ئەوە کێبوو ؟ ئەڵێ : نەء · ئەڵێ : ئەوە ئەو ژنە بوو کە خوا لە ژوور ئاسمانەکانەوە گوێی لەسکاڵای بوو ، وە هات بە دەنگیەوەو نزاکەی گیرا کرد · ئەوە خەولەی کچی سوعلەبە بوو ، بەخوا ئەگەر لەو سەر ڕێیە ڕای‌بگرتمایە بەجێم نەئەهێشت ، مەگەر کاتی نوێژەکان بچوومایە بۆ نوێژو بگەڕامایەتەوە لای ·

* * *

چەندە جوانە دوایی‌هێنانی ئایەتی پێشوو ، بە فەرموودەی « وللكافرين عذاب اليم » بۆ بەستنەوەی ئەو ئایەتە بە ئایەتی پاشوومەوە ، کە باسی ئەو بێبڕوایانە ئەکات کە پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەر ئەکەن ، بە ڕاستیی دوایی ئایەتی پێشوو وەك پردێك وایە ، کە بە سەریا بپەڕێیتەوە ، لەباسەکەی پێشوومەوە ، بۆ باسی دوایی ، کە ئەفەرموێ ( ان الذين يحادون الله ورسوله ) بە ڕاستی ئەوانەی بە پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ئەکەن ( كبتوا ) ریسواو سەرەنگرێ بن(١) ، ( كما كبت الذين من قبلهم) هەروەك ئەوانەی پێش ئەمان سەرەنگرێ کران لە جەنگی بەدردا بە دەستی مسڵمانەکان ·

ئنجا ئەفەرموێ بەوانەی کە پێچەوانەی فەرموودەی خواو پێغەمبەر ئەکەن : ئەوە چۆن لائەدەن لە فەرمانی خواو پێغەمبەر ، لە کاتێکا کە ( وقد انزلنا ئايات بينات ) بە ڕاستی ئایەتانی ڕۆشنمان ناردۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ، وە هەموو بەڵگەو نیشانەیەکمان داوەتێ ، وە هەموو ڕێوشوێنێکمان بۆ ڕووناك کردۆتەوە ،

---

(١) سید قطب ئەڵێ : ئەمە نزایە لە خواوە بۆ سەرەنگرێ بوونیان ، کە نزای خواش بڕیارە ·

وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُهِينٌ (٥) يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعاً .
فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا، أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ. وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ
شَهِيدٌ (٦)

---

**وە هەیە بۆ بێبڕوایان سزای ریسواکەر(٥) لە ڕۆژێکا کە خوا هەموو لایەکیان زیندوو ئەکاتەوە ، ئنجا ئاگاداریان ئەکات بەوەی کە کردوویانە ، کە خوا (هەمووی) هەڵژماردووە ، وە (ئەوان) فەرامۆشیان کردووە ، وە خوا لەسەر هەموو شتێك ئاگادارە(٦) ٠**

---

**واتە هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نی‌یە بۆ لادان لە فەرمانی خواو پێغەمبەر ٠**

**ئنجا ئەم بێبڕوایانە هەروەك خوا لە جیهانا سەرەنگرێیان ئەکات ، هەروا ( وللكافرين ) بۆ بێبڕوایان هەیە ( عذاب مهين ) سزای ریسواکەر ، واتە سزایەکی وا کە هەموو گەورەیی‌و ڕێزێکیان برووخێنێ ، وە هەموو قسەو دەم درێژی‌یەکیان بە درۆبخاتەوە ( يوم يبعثهم الله جميعا ) لە ڕۆژێکا کە خوا هەموو لایەکیان زیندوو ئەکاتەوە ( فينبئهم بما عملوا ) ئنجا ئاگاداریان ئەکات بەوەی کە کردوویانە لە جیهانا ، ( احصاه‌الله ) خوا هەموو کردەوەیەکی هەڵژماردوون لەم جیهانەدا وە یەك بە یەك ئەیداتەوە بە چاویانا لە ڕۆژی خۆیا بە ئاشکرا لەناو خەڵقا بۆ ڕیسواکردنیان ( ونسوه ) وە خۆیان لە بیریان چۆتەوەو فەرامۆشیان کردووە ٠**

**بەڵێ ئەگەر بەندەگان کردەوەی ناپەسەندی خۆیان لە بیر بچێتەوە ، خوا لەبیری ناچێتەوە چونکە ( والله على كل شيء شهيد ) خوا لەسەر هەموو شتێك ئاگادارە ٠**

* * *

**ئنجا نموونەیەك لەم ئاگاداریی خوایە باس ئەکات بە ئایەتی پاشوو ، بە جۆرێکی وا کە بدا لە پەرەی دڵی هەموو خاوەن بیروباوەڕێك .**

**ئەگێڕنەوە کە لە دوای جەنگی بەدر ، ناو بەناو پێغەمبەر ، یەکێك ، یا زیاتری ، ئەنارد بەملاو بەولادا ، بۆ جوستو جۆو دەنگو باس وەرگرتن ، زۆر جار ئەمانە ئەگەڕانەوە ، بێ‌ئەوەی تووشی جەنگێك ببن ، ناو بەناویش تووش ئەبوون ، وە لێیان ئەکوژرا ، ئنجا لەم کاتانەدا ، کە زۆر لە دانیشتووانی مەدینە کەس‌وکاریان لە دەرەوە بوو ، جوولەکەو ناپاکەکان ، دوان‌و سیان سیان ، سەریان ئەکرد بە یەکاو بە چرپە قسەیان ئەکرد ، مسلمانەکان وایان ئەزانی کە کوڕیان ، یا برایان یا کەس‌وکاریان کوژراوە ، وە ئەوان**

ـــم تَرَ أَنَّ اللهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ؟مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ ، وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ ، وَلَا أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَمَا كَانُوا ،

ئایا نازانییت ئــەوی لە ئاسمانەکانو لە زەویی‌دایە خوا ئــاگای لیّ‌یانە ؟ هیچ سرپەی سیّ‌کەسیّك نی‌یە کە خوا چوارەمیان نەبیّ ، وە هیچ پیّنج کەسیّك نی‌یە کە ئەو شەشەمیان نەبیّ ، وەنە کەمتر لەوە و نە زۆر تر نی‌یە کە خوای لەگەڵا نەبیّ لە هەر لایەك بن ،

---

زانیویانە ، وە ئەم چرپەوهوورەیان بۆ ئەوەیە ، لەبەرئەوە مسڵمانەکان بەو سرکە سرکە زۆر خەفەتبار ئەبوون ٠

یاخوا دەردی چرپە نەکەویّتە ناوهیچ کۆمەڵەیەکەوە ، کە لەگەڵ ، داکــەوت ئییتر هەموو ئەشڵەژێن ، وە وورە بەر ئەدەن ، لەبەر ئــەوە مسڵمانەکــان چوونە خزمەت پیّغەمبەر وە ئەم سکاڵایەیان لاکرد ، پیّغەمبــەر بە جوولەکەو ناپاکەکــانی فەرموو ، کە دەست لەم چرپە چرپە هەڵگرن ، وە هەر قسەیەك ئەکەن بە ئاشــکرا بیکەن ، با مسڵمانەکان خەفەتبار نەبن ، بەڵام بە قسەکەی پیّغەمبەریان نەکرد ، وە لەسەر سرپەو سرکەکردنی خۆیان هەر مانەوە ٠

هەر بەمەش دەستیان هەڵ نەگرت بەڵکو کەبەلای پیّغەمبەرا تیّ ئەپەڕیین ،لە جیاتی ئــەوەی سڵاوی لیّ بکــەن و بڵێن «السلام علیك» کــەچی پیّ‌یان ئەووت : « السام علیك » واتە بمرییت ٠ پیّغەمبەر ئەیزانی چی پیّ‌ئەڵێن ، بەڵام خۆی لیّل نە ئەکرد ، وە لە وەرامیانا ئەیفەرموو : «علیك» واتە لە سەر خۆت بیّ ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە ، فەرمووی (الم‌تر)ئایا نازانییت (ان‌الله یعلم ما في السماوات) کە خوا ئەزانیّ ئەوی لە ئاسمانەکان (وما في الارض) و ئەوی لە زەویی‌دایە (ما یکون من نجوی ثلاثة) هیچ سرپەی سیّ کەسیّك نی‌یە (الا هو رابعهم) کەخوا چوارەمیان نەبیّ(ولا خمسة) وەهیچ سرپەی پیّنج‌کەسیّك نی‌یە(الا هوسادسهم) کە ئەو شەشەمیان نەبیّ(ولاادنی من‌ذلك ولااكثر)وە نە کەمتر لەوە و نە زۆرتر نی‌یە (الا هو معهم) کە خوایان لەگەڵ نەبیّ بە زانیین(این‌ما کانوا) لەهەرکویّ‌یەك بن ، لەدەرەوە بن ، یا لە کونی ژوورەوەبن ، لە سەر لوتکەی شاخ بن ، یا لە بن‌دەریا بن ، لە سەر زەویی بن ، یا لە سەر پشتی مانگ‌بن ، چونکە هەرچی لەئاسمان وزەویی دابیّ خوا ئاگای لیّ‌یە ، بە نیشانەی ئەوسکاڵایەی کە خەولــە کردی ، وەخــوا خیّرا

ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٧)
أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَى ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ ،
وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَةِ الرَّسُولِ . وَإِذَا جَاءُوكَ
حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ ،

---

لە پاشا لە ڕۆژی دواییدا ئاگاداریان ئەکات بەوەی کە کردوویانە بەڕاستی خوا ئاگادارە بە هەموو شتێک(٧) ئایا سەرنج نادەیت بەلای ئەوانەی کەجڵەو گیریی کران لە سرپە ، (کەچی) لە پاشا ئەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کەجڵەو گیریی کرابوون لێی ، وە لەگەڵ یەکا بە سرپە ئەدوێن بەگوناهو دەستت درێژیی و بێفەرمانیی پێغەمبەر ، وەکاتێ بێن بۆلات سڵاوت لێئەکەن بەڕەنگێک کەخوا، بەو جۆرە سڵاوی لێ نەکردووییت ،

---

بەدەنگیەوەهات ، وەك لەسەرەتای سوورەتەکەوە باسکرا (ثم ینبئهم بما عملوا یوم القیامة) لەپاشالەڕۆژی دواییدا هەموو لایەکیان ئاگادار ئەکاتبەوەی کەکردوویانە (ان الله بکل شی علیم) بە ڕاستی خوا ئاگادارە بە هەموو شتێک ٠

بەم باسی ئاگاداریی خوایە بە هەموو شتێکی ئاشکراو نهێنی ، ڕێگای کردەوە بۆ هەڕەشە کردن لە ناپاکانی مەدینە،کە هەمیشە خەریکی سرپەو کۆبوونەوە بوون چ لە ناوخۆیانا ، چ لەگەڵ جوو لەکەکانا ، بۆ دوژمنایەتی پێغەمبەر و مسڵمانان ، وەیەک بەیەک گوناهەکانیان نەداتەوە بەچاوا ، ئەفەرموێ :

١ ـ ( الم تر ) ئایا سەرنجنادەیت ( الی الذین ) بەلای ئەوانەی ( نهوا ) کە جڵەو گیریی کران (عن النجوی) لە سرپە و سرکە ، کەچی (ثم یعودون) لەپاشا ئەگەڕێنەوە (لما نهواعنه) بۆ ئەوشتەی کە جڵەو گیرییکرابوون لێی (ویتناجون) وە لەگەڵ یەکا بە سرپە ئەدوێن ( بالاثم ) بە گوناهو ( والعدوان ) و دەستدرێژییو دوژمنایەتی ( ومعصیة الرسول )و بێفەرمانیی پێغەمبەر ٠

٢ ـ ( واذا جاءوك ) وە کاتێك کە جوولەکەکان بێن بۆ لات ( حیوك ) سڵاووت لێ ئەکەن ( بما لم یحیك به الله ) بە سڵاوێك کە خوا بەو جۆرە ، سڵاوی لێ نە کردوویت ، وە لە جیاتی «السلام علیك» پێت ئەڵێن : «السام علیك»واتە مردنت لەسەربێ ، لەکاتێکا کە خوا پێت ئەڵێ : «وسلام علی عباده الذین اصطفی» واتە سڵاو لەبەندە کانی هەڵبژاردەی خوا بێ ٠

وَ يَقُولُونَ فِي أَنْفُسِهِمْ لَوْلاَ يُعَذِّبُنَا اللهُ بِمَا نَقُولُ! حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ(٨) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلاَ تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَةِ الرَّسُولِ ، وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَى، وَاتَّقُوا اللهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ(٩)

---

وه لــه دڵی خۆیانــا ئەڵێــن : ( ئەگــەر ئەمــه پێغەمبــەری خوایــه ) بــۆچی خــوا ســزامان نــادات بەهــۆی ئــەو قسـانەی کــه پێی ئەڵێــین دۆزەخیان بەسه که ئەچنه ناوێوه که جێگایەکی زۆر بەدە(٨) ئەی ئــەو کەســانەی که بڕ واتان هێناوه سرپه تان کەکرد ، سرپه مەکەن بەگوناهو ستەم و بێ فەرمانیی پێغەمبەر ، وه سرپه بکەن به چاکیی‌و پارێزگاریی ، وه خۆتان بپارێزن لەو خوایەی که بۆ لای ئەو کۆ ئەکرێنەوه(٩)

---

٣ ـ (ویقولون في انفسهم)وه جولەکەکان لەدڵی خۆیانا ئەڵێن : ئەگەر ئەمه پێغەمبەری خوایه ( لولا یعذبنا الله بما نقول ) بۆچی خوا سزامان نادا لەسەر ئەو قسانەی که پێی ئەڵێین‌و ئەو پلارانەی که تێی ئەگریین ؟ واته ئەگــەر پێغەمبەر بووایه ، ئەبوو خوا تووشی سزای بکردایناىه لەســەر ئەو هەموو ئازارەی کــه ئەیدەین ، وه لەسەر ئەو هەموو قسانەی که پێی ئەڵێین ، که یەکێکیان سڵاو کردنه کەمانه لێی • ئنجا خوا وەرامیان ئەداتەوه ، ئەفەرموێ ( حسبهم جهنــم ) دۆزەخیان بەسه بۆ سزای بێ برانەوەیان(یصلونها)ئەچنه ناوێوه به ئێجگاریی ( فبئس المصیر ) وه دۆزەخ خراپترین جێگاو پەنایه بۆیان •

ئنجا خوا ئامۆژگاریی مسڵمانان ئەکات ، که چاو لەجوولەکەو ناپاکەکان نەکەن، له سرپەو چرپەدا ، وه پێیان ئەڵێ که ئەم جۆره چرپانه سرووشتی شــەیتانه ، شایستەی مسڵمانان نییه ، تا ئەتوانن مەیکەن ، که هەر کردتان با به چاکــەو یارمەتی‌و دەستگرتن‌بێ ، نەك به گوناهو ستەم وەکو ئەفەرموێ (یا ایها الذین امنوا ) ئەی ئەوانەی کــه برواتان هێنــاوه ( اذا تناجیتم ) که ســرپەتان کــرد ( فلا تتناجوا بالاثم والعدوان ) ســرپه مەکەن به گونــاهو ستەم‌و دەســتدرێژیی (ومعصیة الرسول)وه به بێ‌فەرمانیی پێغەمبەر ، وەکو جوولەکەو ناپاکەکان ئەیکەن ( وتناجوا بالبر والتقوی ) بەڵکو سرپەتان که کرد به شتی باش‌و پارێزگاریی بێ ( واتقوا الله الذي ) وه بترســن لەو خوایــەی ( الیه تحشــرون ) که بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوه ، وه لەبەردەمی ئەوا کۆ ئەبنەوه •

إِنَّمَا النَّجْوَى مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا. وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ شَيْئًا إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ ، وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ (١٠) يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا

---

سرپە لە شەیتانەوەیە ، تـا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە دڵتەنـگ بن ، لە کاتێکا کە هەرچی زیان بێ پێیان ناگەیەنن مەگەر بە فەرمانی خوا ، با هەر بە خوا پشت ببەستن بڕواداران(١٠) • ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە

---

ئنجا باسی هۆی سرپە ئەکات ئەفەرموێ ( انما النجوی ) سـرپە کردن بـە گوناهو ستەم ( من الشیطان ) لەشەیتانەوەیە ( لیحزن الذین امنوا ) تا بڕواداران وا بزانن کە قسە لەوان ئەکەن ، وە بەم بۆنەیەوە دڵتەنگ ببن لەگەڵ ئەمیشە ( ولیس بضارهم شیئا ) کە چرپەی ئەوان زیانەری هیچ شتێکی بڕواداران نی‌یە ( الا باذن الله ) مەگەر بە فەرمانی خوا ، کەواتە ( وعلی‌الله فلیتوکل المؤمنون ) با هەر بە خوا پشت ببەستن بڕواداران •

* * *

دوای ئامۆژگاریی پێشوو ئنجا ئامۆژگاری‌یەکی تـری مسڵمانان ئەکـات ، وە دەستوورێکی تری کۆمەڵایەتیی‌یان بۆ دائەنێ ، ئەفەرموێ«یا ایها الذین آمنوا.»•

ئەگێڕنەوە کـە ڕۆژێکی هەینی پێغەمبەر لـە ژووری مزگـەوتی مەدینـە دائەنیشێ ،وە هاوڕێ‌یەکی زۆر ، لەخزمەتیا ئەبن ، وە شوێنە نزییکەکان لەڕاستو چەپی پێغەمبەرەوە ئەگرن و پڕی ئەکەنەوە ، لەو حەلەدا چەند هاوڕێ‌یەکی تری پێغەمبەر دێن لە یـارانی بەدر ــ کـە پێغەمبەر زۆر بە چاوێکی ڕێزو تایبـەتی تەماشای ئەکردن ، کە یەکێکیان سابتی کوڕی قەیس بووە ، کە نەختێ گوێشـی گران بووە ، وە هەمیشە ویستوویەتی لە نزییك پێغەمبەرەوە دابنیشێ ، تا بـە ئاسانیی گوێی لە فەرمایشی بێ ــ ئەمانە کە دێنو سڵاو ئەکەن ، تەماشا ئەکـەن لە نزییك پێغەمبەرەوە جێگا نەماوە ، ئەمانیش بە پێوە ئەوێستن بۆ ئەوەی کـە تەکەیان بۆ بکەن ، بەڵام کەس ناجووڵێ ، پێغەمبـەر پێی ناخـۆش ئـەبێ ، وە ئەفەرموێ بەوانەی کە لە نزییك خۆیەوە دانیشتوونو لە یارانی بەدر نیین : هەستن تەکە بکەن ، بەڵام ئەوانەی کە هەڵئەستن پێیان ناخۆش ئـەبێ ، هـەروەك ناپاکەکانیش ڕەخنە لەپێغەمبەر ئەگرن : کە چۆن یەکێك لەپێشەوە هاتبێو جێی خۆی گرتبێ هەڵی‌ئەستێنن بۆ یەکێك کە خۆی لەهاتنا دواکـەوتبێ • ئنجا بـەم بۆنەیەوە ، ئەم ئایەتـە دێتـە خوارەوە ، ئەفەرموێ ( یا ایهـا الذین امنوا) ئەی

إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ انشُزُوا فَانشُزُوا يَرْفَعِ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ۚ وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (١١)

کاتێك پێیـان ووترا لە دانیشتنگاکانا تەکە بکەن ( ئێوەش ) تەکە بـکەن خواش گوشادیی بە ئێوە ئەدا ، وە کاتێك کە پێتان ووترا هەستن ، هەسـتن ، خـواش پایەی ئەو کەسانە بـەرز ئەکاتەوە لە ئێوە کـە بڕوایان هێناوە وە ئەوانـەی کە زانینیان پێ‌بەخشراوە ــ بە چەند پلەیەك ، وە خوا ئاگادارە بەوەی کە بیکەن(١١)

ئەوکەسانەی کەبڕواتان هێناوە (اذا قیل لـکم ) کـاتێك پێتـان ووتـرا (تفسحوا) تەکە بکەن (في المجالس)لە دانیشتنگاکانا (فافسحوا)ئێوەش جێگا بکەن بۆ مەردوم ، بەم ڕەنگە تەکە بکەن ، یاهەستن بایەکێکی تر لە شوێنەکەتان دابنیشێ (یفسح‌الله لکم) خواش فراوانیی‌و گوشادییتان پێ‌ئەبەخشێ لەهەردو جیهانا (واذا قیل انشزوا) وە کاتێك پێتان ووترا هەستن و جێگا بەجێ‌بێلن بۆ یەکێك ، کە لەئێوە شایستە تربێ بەو شوێنە ، لەبەرپیریی ، یـازانیین و خـوێندەواریی (فانشزوا) ئێوەش هەستن بێ‌ئەوەی پێتان ناخۆش‌بێ ، چونکە هەر مسـلمانێك کە لەوێڵ‌و ئـەدەبا گەیشت بەم پایەیە ، ئەو حەلە خواش پایەی بەرز ئەکاتەوە لە هەردو جیهانـا ، وەکو ئەفەرمـوێ (یرفع الله الذین امنوا منکم) خـواش پایەی ئەو کـەسانە بەرز ئەکاتەوە لەئێوە کە بڕوایان هێناوە وە فەرمانبەریی پێغەمبەر ئەکەن ، نەخوازەلا ئەوانەیان کە زاناو خوێندەوارن ، وەکو ئەفەرموێ ( والذین اوتوا العلم درجات ) وە ئەوانەی کە زانین‌و زانیاری‌یان پێ‌بەخشراوە ــ بە چەنـد پلەیەك بـەرزیان ئەکاتەوە ( والله بما تعملون خبیر ) وە خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن ٠

* * *

هەروا قورئان دەرسێکی تریان دائەداو ، وێلێکی تریان فێر ئەکات،بەرانبەر بە پێغەمبەر کە مسلمانەکان یەکەیەکە زۆر ئەچوونە خزمەتی ، هەریەکە لەبابەت ئیشێکی خۆیەوە ــ با هیچ‌و پووچیش بـووبێ ــ وە زۆریان خەریك ئەکرد ، وە وەختی بەنرخ و پڕ سوودیان بەخۆڕایی بەخت ئەکرد ، بێ ئەوەی لێکی بدەنەوە ، کەپێغەمبەر وەختی ئەوەی نی‌یە هەر کەسێک هـەستێ بچێ بۆ شتێکی هیچ‌و پووچ دەست بکات بەچرپە چرپ لەگەڵیـا ، بەڵێ ئەگەر یـەکێک قسەیەکی گرنگ ، یا پرسیارێکی بەنرخ ، یا راوێژێکی ببێ قەیناکات ، بە مەرجێك کە زۆر دانەنیشێ

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ، ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَكُمْ وَأَطْهَرُ . فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٢)

**ئەی ئەوکەسانەی کەبڕواتانهێناوە کاتێك کەقسەی پەنهانیتانکرد لەگەڵپێغەمبەرا ، پێش قسە کردنەکەتان پارەیەك بکەن بە خێر ، ئەمە بۆ خۆتان باشترو پاکترە ، ئنجا ئەگەر هیچتان شك نەبرد خوالێخۆشبوو میهرەبانە(١٢)**

**، بەلاّم هەرچی بیەوێ بچێ لەگەڵ پێغەمبەرا سرپە بکات ، بۆقسەیەکی بێ نرخ ، یاهەر بۆ ئەوەی پێی بلێن : فلاّن کەس ئەمڕۆ بەتایبەتی لەخزمەت پێغەمبەرا زۆر مایەوە ، یاقسەی زۆری کرد ، یافلاّن ، جێی بڕوای پێغەمبەرە ، زیاد لەهەموان ، ئەوە گوناهە ، چونکە کاتی بەنرخی پێغەمبەر بە هیچە نەکوژێ ، جگە لەوە کە لە تەنشت هاورێکانی پێغەمبەرەوە ناپاکەکانیش داوایان ئەکرد، بەتەنیا بچنە خزمەت پێغەمبەر ، وە خەریکی بکەن ، وا دیارە پێغەمبەر لەم ڕووەوە زۆر تەنگەتاو بووە ، خۆشی لە بەر میهرەبانیی و نەرم و شلیی خۆی ، نەی ویستووە جوابی کەس بدات، ئنجا خوا ویستی کەمێ باری شانی سووك بکات ، وە ناپاکەکانو ئەوانەی کە ئیشی زۆر گرنگیان نییە ، لێی دوور بخاتەوە ، وەهاورێکانیشی لەمانە بگەیەنێ ، هات خەرجێکی دانا لەسەر ئەوانەی کە ئەیانەوێ وەختی داگیر بکەن ، کە ئەو ماوەیە ماڵی مسڵمانانە ، وە هەموو مسڵمانێك بەشی تیا هەیە ، فەرمووی (یا ایها الذین امنوا ) ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە(اذا ناجیتم الرسول)کاتێك کە ویستتان قسەی پەنهانیی بکەن لەگەڵ پێغەمبەرا ( فقد موابین یدی نجواکم صدقە ) پێش قسە کردنەکەتان خێرێك بکەنو پارەیەك بدەن بە هەژاران (ذلك خیر لکم) ئەمە بۆ خۆتان باشترە ،چونکە ئەبێ بەکەفارەتی ئەوگوناهەی کەپێغەمبەر خەریك ئەکەن، وە یەکێکی تربێ بەش ئەکەن ، لەوەی کە ئەگەر پرسیارێکی بێ بیکات لێی (واطهر) وە پاکترە بۆ خۆتان ،واتە دڵتان پاك ئەکاتەوەلە گوناهی ئەوەی، ئەگەر بتانەوێ بەو چرپە چرپە پایەیەك وەرگرن لەبەر چاوان (فان لم تجدوا) ئەگەر هیچتان شك نەبرد بیکەن بە خێر ( فان الله غفور رحیم) بێ گومان خوا لێخۆشبوو میهرەبانە .**

**حەزرەتی علی ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ، تاقە دینارێکی زێڕی بوو ، گۆڕییەوە بە درهەم ، وە هەرچەند قسەیەکی ببوایە لە**

شْفَقْتُمْ أَنْ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ؟ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا للهَ وَرَسُولَهُ، واللهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ (١٣)

ئایا ترسـان (له هەژاریی) که خێرێـك پێش سرپەکەتان بخـەن ، ئنجا که خێرەکەتان نەکـرد وه خـواش تۆبـەکەی لێ گیرا کـردن ، ئیپتر نوێـژ بکەنو زەکات بدەنو فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکـەن ، وه خـوا ئاگاداره بـەوەی که ئەیکەن (١٣)٠

خزمەت پێغەمبـەرا ، درهەمێکی ئەبـەخشیی ، ئنجا ئه چـووه خزمـەت پێغەمبەر قسەکەی ئەکرد ٠

بەمه زۆر کەس دەستی هەڵگرت لەو سرکه سرکەی که جـاران ئەیکرد لەگەڵ پێغەمبەرا ، چونکه یا پارەی نەبوو بیکات بەخێر ، وەیانەی ئەویست پارەکـەی بۆ ئەوه بەخت بکات ، هەروەك زۆر له مسڵمانه کـانیش تێگەیشتن کـەچرپه کردن لەگەڵ پێغەمبەراباش نیـیـه ، وەدەستیان لێهەڵگرت ، وەئەوی مەبـەست بوو لەم ئایەته هاته دیی، ئنجا خوا ، دوای ده ڕۆژ لەدانانی ئەم خەرجه ، ئەم پارەی لەسەر هەڵگرتن ، وەرێگای دابۆهەموو کەسێك که چرپه لـەگەڵ پێغەمبـەر بکات ، بـێ ئەوەی که خێرێك پێش بخات،وه ئەم ئایەتەی نارده خوارەوه ، فەرمووی (أشفقتم) ئایا له هەژاریی ترسان کەوا پێ دزکێنتان کرد لەوەی (ان تقدموا بين يدى نجولكم صدقه) که خێرێك پێش سرپه کەتان بخەن (فاذلم تفعلوا) ئنجا کـه خێره کـەتان نەکرد ، لەگەڵ ئەوەی که بووشتان(١) ( وتاب‌الله عليكم ) وه خواش تۆبەی لێگیرا کردن لەگوناهی ئەو خێرەی که لەگەڵ بوونا نەتانکـرد (فاقيموا الصلاة) ئیپتر نوێژی به هۆشو گۆش بکەن ( واتوا الزكاة ) وه زەکات بدەن (واطيعواالله ورسوله) وه فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بکـەن (والله خبير بما تعملون) وه خـوا ئاگاداره بەوەی که ئەیکەن ٠

* * *

ئەگێڕنەوه که ناپاکەکانی مەدینه ئەچوونه کـۆڕ « مجلس » ی پێغەمبەرو هاوڕێکانی دائەنیشتن ، وه دەنگو باسی پێغەمبەرو مسڵمانەکانیان ئەبـرد بۆ جوولەکەکان ، ئەم ناپاکانه دوو سەرکردەیان بوو ، یەکێکیان عبدالله‌ی کـوڕی

(١) بەڵام ئەوانەی که نەیانبوو خێر بکەن ، لەپێشەوه فەرمووی: «فان لم تجدوا فان‌الله غفور رحيم» ٠

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْماً غَضِبَ اللهُ عَلَيْهِمْ؟ مَاهُمْ مِنْكُمْ وَلاَ مِنْهُمْ، وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٤) أَعَدَّ اللهُ لَهُمْ عَذَاباً شَدِيداً، إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٥) إِتَّخَذُوا

**ئایا بۆ سەرنجێك نادەیت بە لای ئەوانەی کە دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ گەلێك کە خوا خەشمی لێگرتوون ؟ ئەوان نە لە ئێوەنو نە لەوانن ، وە سوێند ئەخۆن بە درۆ لەکاتێکا کە خۆیان ئەزانن ( درۆئەکەن)(١٤) خوا سزای سەختی بۆ ئامادەکردوون ، بە ڕاستی ئەوی ئەوان ئەیانکرد کارێکی خراپ بوو(١٥) سوێندەکانیان کرد**

«أبی»ی کوڕی سەلوول ، ئەوی تریان عبداللە‌ی کوڕی «نەبتەل» • ڕۆژێك پێغەمبەر لەناو هاوڕێکانیا دائەنیشێ ، ئەفەرموێ : « ئێستا پیاوێك دێتە ناوتان بە دڵێکی پیسو چاوێکی شەیتانی‌یەوە » دوای ئەوە عبداللە‌ی کوڕی نەبتەل ئەچێتە لایان • پێغەمبەر پێ‌ی ئەفەرموێ : تۆ بۆچی خۆتو هاوڕێکانت جنێو بەمن ئەدەن ؟ ئەویش سوێند ئەخوات کە جنێومان نەداوە • پێغەمبەر ئەفەرموێ : بەڵێ داوتانە • ئەویش هەڵئەستێ ئەچێ هاوڕێکانی ئەهێنێ • هەموو سوێند ئەخۆن کە جنێویان نەداوە ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتانە دێنە خوارەوە ، ئەفەرموێ ( الم تر ) ئایا بۆ سەرنجێك نادەیت ( الی الذین ) بەلای ئەو ناپاکانەی ( تولوا ) کە دۆستایەتی ئەکەن ( قوما ) لەگەڵ گەلێکی وەك جوولەکەدا (غضب‌الله علیهم) کە خوا خەشمی لێ‌گرتوون ، وە نهێنی مسڵمانەکانیان پێ‌ئەڵێن (ماهم منکم) ئەو ناپاکانە ، نە لە ئێوەن ( ولامنهم ) وە نە لە جوولەکەن ( ویحلفون علی الکذب ) وە سوێند ئەخۆن بە درۆ کە هەرگیز جنێویان نەداوە (وهم یعلمون) لەکاتێکا کە خۆیان ئەزانن درۆ ئەکەن • ئنجا خوا باسی سزایان ئەکات لە ڕۆژی دوایی‌دا ، ئەفەرموێ (اعد الله لهم عذابا شدیدا) خوا سزای سەختی بۆ ئامادە کردوون لە سەر ئەو درۆو ناپاکی‌یانەی کە ئەیکەن ، وەکو ئەفەرموێ ( انهم ساء ماکانو یعملون) بەڕاستی ئەوی ئەوان ئەیانکرد لە دۆستایەتیی جوولەکە و دوژمنایەتیی مسڵمانان کارێکی زۆر خراپ بوو •

لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی : کاتێك کە پێغەمبەر نەنگێك لە ناپاکەکان بگرێ ونهێنی یەکیان ئاشکرا بکات ، سوێندی درۆ ئەخۆن کەشتی وانەبووە ، وە خۆشیان ئەزانن کە درۆ ئەکەن ، بەڵام هەر ئەیانەوێ بەو سوێندە ، خۆیان بپارێزن لە دەستدرێژیی مسڵمانەکانو زیان‌پێ‌گەیاندنیان ، وەکو ئەفەرموێ ( اتخذوا

أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللهِ . فَلَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ (١٦) لَنْ تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُمْ مِنَ اللهِ شَيْئاً . أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (١٧) يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللهُ جَمِيعاً . فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ . وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ

**بە قەڵغانو جڵەوگیریی (مەردوم)یان کرد لە ڕێی خوا ، ئنجا بۆ ئەوان هەیە سزای ڕیسواکەر(١٦) ماڵومناڵیان هیچ شتێك ( لەسزای خوا ) دوورناخاتەوە لێیان ، ٠ ئەوانە یارو هاودەمی ئاگررن ، تیا ئەمێننەوە بە ئێجگاریی (١٧) لە ڕۆژێکا کەخوا هەموویان زیندوو ئەکاتەوە وسوێندی بۆئەخۆن، هەر وەك سوێند ئەخۆن بۆ ئێوە (لەجیهانا) وە وا ئەزانن کە شتێکیان دەست خستووە ،**

**جنة) سوێندەکانیان ئەکرد بە قەڵغانو سوپەر ، وە ناپاکییەکەی خۆیانیان پێ ئەشاردەوە ، بە جۆرێکی واکە زۆر کەس بەمسڵمانیان بزانن ، ئنجا لەو پەردەیەدا دڵی زۆر کەسیان سارد ئەکردەوە لە مسڵمانەکان لە جەنگ و یارمەتیی دانی پێغەمبەر ، وەکو ئەفەرموێ (فصدوا عن سبیل‌الله) جڵەوگیرییانکرد لە ڕێی خوا (فلهم عذاب مهین) ، ئنجا بۆ ئەوان هەیە سزای ڕیسواکەر (لن تغنی عنهم اموالهم ولا او لادهم من الله شیئا) ماڵ و مناڵیان هیچ تۆڵەو سزایەکی خوایان لێ دوور ناخاتەوە (آولئك اصحاب النار) ئەو ناپاکانە یارو هاو دەمی ئاگرن (هم‌فیها خالدون) ئەوان تیا ئەمێننەوە بە ئێجگاریی (یوم یبعثهم الله جمیعا) لە ڕۆژێکا کە خوا هەرچی ناپاك هەیە هەموویان زیندوو ئەکاتەوە، بەڵام لەو ڕۆژەشا، وەلەبەر دەمی خوادا دەست لە درۆی خۆیان هەڵناگرن ، وەکو ئەفەرموێ (فیحلفون له) ئنجا سوێند ئەخۆن بۆ خوا کە خاوەن‌بڕوا بوون ، هەروەك هاوبەش پەیداکەرەکان کە لە ڕۆژی دواییدا بە خوا ئەڵێن : «والله ربنا ما کنا مشرکین»(١) انعام : ٢٣ ٠**

**(کما یحلفون لکم) هەروەك سوێند ئەخۆن بۆئێوە ـ ئەی پێغەمبەر ـ لەجیهانا کە بڕوا دارن (ویحسبون أنهم علی شی) وە لەو ڕۆژەدا وا ئەزانن بەو سوێندە درۆیانە شتێکیان دەست خستووە ، هەروەك لە جیهانا بە سوێندی درۆ مەردومیان**

١ ــ واتە بەو خوایەی کە پەروەردگاری ئێمەیە ، هاوبەش پەیداکەر نەبووین لە جیهانا ٠

أَلاَ إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ (١٨) إِسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنْسَاهُمْ ذِكْرَ اللهِ . أُولَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ . أَلاَ إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الخَاسِرُونَ (١٩)

---

با بزانن کە بە راستیی هەر ئەوانن درۆزن(١٨) شەیتان زاڵ بووە بە سەریانا (بە جۆرێك ) کە یادی خوای لە بیر بردوونەتەوە ، ئەوانە دەستەی (نەفس و) شەیتانن ، با بزانن کە بەڕاستی هەر لەشکری شەیتان زیان بارە (١٩) ٠

---

فریب ئەداو خۆیان ڕزگار ئەکرد (الا) بابزانن (انهم هم الکاذبون) کە بەڕاستی هەر ئەوانن درۆزن ٠

ئنجا باسی هۆی ئەمچۆنێتی‌یەیان ئەکات، ئەفەرموێ (استحوذ علیهم الشیطان) نەفس‌و شەیتان زاڵ بووە بەسەریانا ، وە بەو هۆیەوە (فانساهم ذکر الله) یادی خوای لەبییر بردوونەتەوە ، نەبە دڵ یادی ئەکەن ، وەنەبە زبان باسی ئەکەن ، وە بوون بە دەستەی شەیتان ، وەکو ئەفەرموێ (اولئك حزب الشیطان) ئەوانە دەستەی نەفس‌و شەیتانن ، لە ژێر ئالای ئەوا ئەوێستن ، وە بە فەرمانی ئەو هەڵئەستن ، بەراستی ئەوان ، بەهەشتیان فرۆت بە دۆزەخ وڕێ نموونی یان فرۆت بەگومڕایی، لەبەر ئەوە زەرەر مەندن ، وەکو ئەفەرموێ ( الاان حزب الشیطان هم الخاسرون ) با بزانن کە بە ڕاستیی هەر دەستەی نەفس‌و شەیتان زیانبارن ٠

لەم شەش ئایاتی پێشووەوە کە تەفسیرمان کرد ، دەرکەوت کە ناپاکەکانی مەدینە لە وکاتەدا کە ئەم ئایە تانە هاتوو نەتە خوارەوە ، هەمییشە لەگەڵ جوولە کەکانا بەدزی‌یەوە، خەریکی کنەکردن بوون، بۆڕووخاندنی مسڵمانەکان، هەروەك دەرئەکەوێ کە مسڵمانەکان لەو حەلەدا بەهێزبوون ، بە ڕەنگێکی‌وا کە ناپاکەکان لێ‌یان ترساوون ، بۆیە هەرچەند پێغەمبەر شتێکی ئەدایەوە بەڕوویانا ، دەستیان ئەکرد بەسوێند خواردنی درۆ، کەشتی وانە بووە، لەترسی ئەوەی نەوەك شتێکیان لێ دەر کەوێ ، ومسڵمانەکان دەستیان لێ بوەشێنن ٠

* * *

لەبەر ئەوەی کە ناپاکەکان بەدزی‌یەوە دۆستایەتی یان ئەکرد لەگەڵ جوولەکەکانا ، وە لایان وابوو کە جوولەکە ، لەمەدینەدا هێنزێکن ، وە لە ڕۆژی تەنگانەدا هەموو جۆرە هیوایەکیان لێ‌ئەکرێ ، خوا ویستی بێ‌هیوایان بکات ، وە تێ‌یان بگەیەنێ، کە خوا بڕیاری‌داوە بۆ دوژمنەکانی، ڕیسوایی‌و پشتهەڵکردن، هەر وەك بڕیاری داوە بۆ خۆی‌و پێغەمبەرەکەی زاڵبوون‌و سەرکەوتن ، فەرمووی

إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللهَ وَرَسُولَهُ أُولَـٰئِكَ فِي الْأَذَلِّينَ(٢٠) كَتَبَ اللهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي ، إِنَّ اللهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ(٢١) لَا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ

بەڕاستی ئەوانەی کەدوژمنایەتیی خواوپێغەمبەری خوائەکەن، ئەوانە لەریسواترینی مەردومن(٢٠) خوا نووسیوێتی کە منو پێغەمبەرانم زاڵئەبین ، بە ڕاستیی خوا تواناو زاڵە(٢١) گەلێکی بڕوادارت دەست ناکەوێ

(ان الذین) بەڕاستی ئەوانەی (یحادون الله ورسوله) کەدوژمنایەتی خواوپێغەمبەری خوا ئەکەن (اولئك) ئەوانە (في الاذلین) لە ڕیسواترینی مەردومن (کتب الله) خوا نووسیوێتی ، واتە بڕیاری داوە (لاغلبن انا ورسلی) کە منو پێغەمبەرانم زاڵ ئەبین بەسەر دوژمنانا (ان الله قوی) بەڕاستی خوا توانایە لەسەر یارمەتی پێغەمبەرانی خۆی (عزیز) زاڵە لەو کارەدا کە بیەوێ .

بەڵێ ئەوی تائێستا ڕوویداوە لە سەر زەویی هەمووی هەرزاڵ بوونی بڕوادارو خوا پەرستان بووە بەسەر بێبڕوایانو هاوبەش پەیداکەرانا ، یەکێك ئەگەر تەماشای جەنگەکانی پێغەمبەرو یارانی بکات ، تێئەگات کە هەمیشە لەشکری بڕواو لەشکری تاکو تەنیایی خوا ، زاڵبووە بەسەر لەشکری بێبڕواو لەشکری هاوبەش پەیداکەرانا .

لێرەدا مزگێنییەکی زۆر گەورە هەیە بۆ بڕوادارانی بەڕاستی ، کە هەمیشە خوایان لەگەڵە ، وە دەستی وا بە پشتیانەوە ، بەو مەرجەی کە لە چوارچێوەی فەرموودەو فەرمانی ئایین دەرنەچن ، بەڵام کە دەرچوون ، خوا زەبوونیان ئەکات ، وە دوژمنیان بە سەرا زاڵ ئەکات ، تا پەشیمان بنەوەو بگەڕێنەوە .

* * *

لە ئایەتەکانی پێشوودا ئامۆژگاریی بڕوادارەکانی کرد ، کە دۆستایەتی نەکەن لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەرا ، لێرەدا دوایی سوورەتەکە ئەهێنێ بە ستایشی ئەو بڕوادارانەی ، کە نەك هەر دۆستایەتیی ناکەن ، لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەرا، بەڵکو دوژمنایەتیشیان لەگەڵ ئەکەن، دوژمنایەتییەکی وا کە سەربکێشێ بۆ کوشتن ، ئەفەرموێ ( لاتجد قوما یؤمنون ) گەلێکی بڕوادارت دەستناکەوێ

بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ. وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ. وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا .

---

**به خواو رۆژی دوایی ، که دۆستایەتیی بکەن لەگەڵ ئەوانەی که دوژمنایەتیی خواو پێغەمبەری خوا ئەکەن، بائەو دوژمنانەش باوکیان‌بن،یاکوڕو براوخزمیان‌بن،ئەوانە خوا بڕوای نووسیوه له دڵیانا ، وه پشتیوانیی کردوون به گیانێك لەلایەن خۆیەوه وه ئەیانباته بەهەشتانێکەوه که جۆگه ئاوی زۆر ئەڕوا به بنیانا ، هەتا هەتایه لەو بەهەشتانەدا ئەمێننەوه ،**

---

**( بالله والیوم الاخر) به خواو ڕۆژی دوایی ، که (یوادون) دۆستایەتی بکەن (من حادالله ورسوله ) لەگەڵ ئەوانەی که دوژمنایەتی خواو پێغەمبەری خوا ئەکـــەن ( ولو کانوا ) ئەگەر چی ئەو دوژمنانه ( اباءهم ) باوکیان بن ، وەك ابوعبیدەی جراح که عبداللەی باوکی خۆی کوشت له جەنگی ئوحودا ( او ابناءهم ) یا کوڕیان بن ، وەك ئەبوبکر که عبدالرحمانی کوڕی بانگ کرد ، بۆ جەنگی دوو به دوویی له ڕۆژی بەدردا (او اخوانهم) یا برایـــان بن ، وەك مصعبی کوڕی عومەیر ، که عوبەیدی بـــرای کوشت له جەنگی ئوحودا (او عشیرتهم) یا خـــزمو خوێشیان بن وەك عومەری کوڕی خەتاب که خاڵی خۆی کوشت که عاصی کوڕی هشامه لەجەنگی بەدردا ، وه حەمزەو علیو عوبەیدی کوڕی حارث که ئامۆزایانی خۆیانیان کوشت واته بڕوا به خواو ڕۆژی دوایی کۆ نابێتەوه لەگەڵ دۆستایەتیی دوژمنانی خـــواو پێغەمبەری خوادا ، چونکه کەسێك کەسێکی خۆشویست ئیتر لەگەڵ دوژمنەکەیا، دۆستایەتیی ناکات ، بەم ڕەنگه حەزی له چاکەی‌بێ ، وه ڕێی چاکی نیشان بدات، بەڵام هاتوچۆو قسەو گوفتوگۆ قەیناکات .**

**( أولئك ) ئەوانەی که لەگەڵ دوژمنانی خوادا دۆستایەتیی ناکەن ( کتب في قلوبهم الایمان) خوا بڕوای نووسییوه له دڵیاناو جێ‌گیری کردووه (وایدهم) وه پشتیوانی کردوون ( بروح منه ) به گیانێك لەلایەن خۆیەوه ، واته خۆیـــان نەیان ئەتوانی بگەن بەم پایەیه ، ئەگەر یارمەتیی خوایان لەگەڵ نەبوایه (ویدخلهم جنات ) وه ئەیان‌باته بەهەشتانێکەوه ، که ( تجری من تحتها الانهار ) جۆگه ئاوی زۆر ئەڕوا به بنیانا ( خالدین فیها ) هەتـــا هەتایه ئەمێننەوه لـــەو بەهەشتانەدا ، ئەمه شیان که دەست ئەکەوێ ، لەپاداشی ئەو فداکاری‌یانەن که له جیهانا کردوویانه**

...ضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ، أُولَئِكَ حِزْبُ اللهِ ، أَلَا إِنَّ حِزْبَ ...لَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٢٢)

خوا لێیان خۆشنوود بوو ، وە ئەوانیش لە خوا خۆشنوود بوون ، ئەوانەن ...ـستەی خوا • با بزانن کە هەر دەستەی خوایە ڕزگار(٢٢)

(رضی‌الله عنهم) خوالێیان خۆشنوود بوو، بەهۆی ئەو خواپەرستیی‌و گیانفیدایی‌یەی کە کردویانە (ورضوا عنه) وە ئەوانیش لە خوا خۆشنوود بوون ، بەم هەمــوو میهرەبانی‌یەی کە کردیی لەگەڵیانا ، وە بەم هەموو پاداشەی کە ڕشتی بە سەریانا (اولئك)ئەوانە(حزب‌الله)دەســتەی خوان ، وە لەژێــر بەیداخی ئــەوان ، وە بــە سەرکردەیی ئەوو ئایینی ئەوەوە ، ئەڕۆن ، وە بە ڕێنموویینی ئەو ملی ڕێ‌ئەگرن ( الا ) با بێدار بنەوەو بزانن کە ( ان حزب‌الله هم المفلحون ) هەر دەستەی خوایە ڕزگار •

کەواتە ئەی مسڵمانی بەڕاستی ، دەخیل سەد دەخیل ، هەر لەگەڵ خوابە ، وە لەدەستەی ئەوبە ، وە هە ر لەژێر بەیداخی خواو خۆشەویستانی خوادا بە ، وە هەگیز نزیکیی لەشکری نەفس‌و شەیتان‌و خۆشەویستانیان ، نەکەوییتەوە •

## سوورەی «حشر» ه

مەدەنی‌یە ، ٢٤ ئایەتە ، ٤٤٥ ووتەیە ١٩١٣ پیتە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە دەر بارەی جوولەکەکانی «بنی نضیر» هاتۆتە خوارەوە ، کەگەڕەکێك‌بوون لەقەراخ شاری مەدینە، کاتێك کەپێغەمبەر کۆچی‌کرد لەمەککەوە بۆ مەدینە،دانیشتووانی ئەم گەڕەکە ، پەیمانیان‌بەست لەگەڵ‌پێغەمبەرا :کە ئەمان کلا «محاید» بن لەگەڵیا ، نەیارمەتی دەری بن و نەزیانیشیان ببێ بۆی ، کاتێک‌کە پێغەمبەر لە جەنگی بە دردا زاڵ بوو بەسەر لەشکری قورەیشا ، بنونضیر ووتیان : ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە ، کەتەورات باسی ئەکات ، وەسیفەتەکانی ناو ئەبات ، وەئەمە هەرگیز لە جەنگا ناشکێ ٠ کە مسڵمانەکان لە جەنگی ئوحودا شکان ، بنونضیر دڵیان گۆڕیی لەگەڵ پێغەمبەرا ،بەجۆرێک کە«کعب» ی کوری «أشرف» ـ کە سەرکردەی جوولەکەکان بوو ـ هەجوێکی زۆر ناشرینی پێغەمبەری کرد ، وە لەگەڵ چل کەس لە بنی‌نضیر چوو بۆ مەککە وە لەتەنشت « کعبە » لەگەڵ ئەبوسفیانی سەرۆکی قورەیش ، پەیمانی یەکێتی‌یان بەست ، وە بوون بە سوێند خۆری یەکتریی لەدوژمنایەتی پێغەمبەرا ، وە بەم بۆنەیەوە پێغەمبەر ، ڕێی محمدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری‌دا بۆ کوشتنی کعبی کوڕی اشرفو کوشتی ٠

لە سەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچیی ، لە ناوەندی جەنگی ئوحودو خەندەقا ڕۆژێ پێغەمبەر خۆی‌و دە کەس لەیارانی ، کە ئەبوبکرو عومەرو علی‌یان تیائەبێ، ئەچن بۆ گەڕەکی « بنی نضیر » ـ کە نیو سەعات لەمەدینەوە دوور بووە ـ بۆکارێك ، بەدییەمن جوولەکەکان پێش‌وازی‌یەکی گەرم‌وگوڕیان لێ‌ئەکەن ، وە پێغەمبەر چی‌یان پێ‌ئەڵێ ، ئەوان بەڵێنی پێ‌ئەدەن ، بەڵام لەژێرییشەوە لەڕاوێژی کوشتنی پێغەمبەرا ئەبن ، چونکە کە تەشریفی ئەگاتە ئەوێ ، لەبن سێبەری دیوارێکا دائەنیشێ ، جوولەکەکان لەناو خۆیانا ئەڵێن هەرگیز هەلی وامان بۆ هەڵناکەوێ ، کە ئەم کابرایە بکوژیین ، وە خۆمان ڕزگار بکەین لەدەستی ، کێ ئەتوانێ بەردێکی گەورە لەسەربانەوە بدا بەسەریا ؟ عەمری کوڕی جەحاشی کوڕی کەعب

، دەستەبەر ئەبێ ، وە بەردێکی زل ئەباتە سەربان ، لەوەدا ئـەبێ کە بیـهـاڵێ بەسەری پێغەمبەرا ، پێغەمبەر خەبەردار ئەکرێ لەلایـەن خـواوە ، بـەوەی کە جوولەکەکان لەدڵیانایە ، خێرا ڕاست ئەبێتـەوەو ئەڕوا ، وەك ئیشـێکی خـۆی بێ‌و بچێ بیکات‌و بگەڕێتەوە ، هاوڕێکانی زۆر چاوەڕوانی ئەکەن هەر ناگەڕێتەوە ، کە هەڵئەستن‌و پرسیار ئەکەن ، تێ‌ئەگەن کە تەشریفی چۆتەوە بۆ مەدینە ٠

کاتێك کە جوولەکەی «بنی نضیر» ئەم ناپاکی‌یەیان کرد ، پێغەمبـەر ناچار بوو بەوەی کە پەیمانەکەیان بداتەوە بەسەرا ، بەپێی دەستووری قورئان کە ئەفەرموێ : «فاما تخافن من قوم خیانة فانبذ الیهم علی سواء،ان الله لایحب الخائنین(١)»انفال٥٨
تامەیدانیان نەبێ جارێکی تر دەستێکی تری ناپاکانە بووەشێنن لە پەنای پەیمان و دۆستایەتی‌دا ٠

پێغەمبەر بەپێی ئەم دەستوورە پەیمانەکەی«بنی نضیر»ی هەڵوەشانەوە ،وە بە لەشکرێکەوە چووە سەریان ، وە پێی‌ووتن : لەماوەی دە ڕۆژا ئەبێ لێرە بڕۆن ، وە دراوسێتی من بەجێ‌بێڵن ، وە هەرچێکیشتان هەیـە لەگـەڵ خۆتانـــا بی‌بەن ، ئەمێنێتەوە باخاتەکەتان ، ئەویش ئەتوانن یەکێکی بەسەرەوە دابنێن ، بـــەرو بوومەکەتان بۆ کۆبکاتەوە ، بەلاّم ناپاکەکانی مەدینـە بە سـەرکردەیی عبدالله‌ی کوڕی ابێ ، جوابیان بۆ ناردن کە جێی خۆیان بەجێ‌نەهێڵن ، وە بە بێ‌جـەنگ نەچنە دەرەوە ، ئنجا ئەگەر جەنگیان لەگەڵ کردن ، ئێمـە یارمەتیتان ئـەدەین ، وە ئەگەر دەریان کردن ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا ئەڕۆین‌و ئێرە بەجێ‌دێڵین ، بـەم بەڵێنە ، جوولەکەکان پشت ئەستوور بوون وە خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمبەرا ، وە چوونە ناو قەڵاو قوللەکانیانەوە ، وە سەری کۆڵانەکانیان هەڵچنی ، پێغەمبەر کە ئەمەی زانی ، دەوری گـرتن ، وە فەرمانی‌دا بە بڕینـی دار خورماکانیان ٠ بە بڕین‌و سووتاندنی چەند دارێك وورەیان بەردا ، وە دڵیان بە شوێنەکەیانەوە نەمـا ، دوای بیست‌وشەش ڕۆژ کە نائومێد مان ، لـە یارمەتیی ناپاکەکان ، داوایان کرد لە پێغەمبەر کە نەیان‌کوژێ ، وە ڕێیان بدات بۆ ڕۆین وە هەرچێکیان هەیە بی‌بەن لەگەڵ خۆیانا ، بێجگە لەچەك ، پێغەمبەر بەمە ڕازیی بوو ، وە هەرچێکیان بوو ، نایانە سەر پشتی حوشترەکانیان‌و بردیان ، تەنانەت خانۆکانیشـیان ڕوخانـد ، وە دارو دەرگاو پەنجەرەکانیـان بـرد ، ئنجـا بـەم بۆنەیەوە ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە ، فەرمووی ( سبح‌لله ) بە پاکیی یادی خـوای

---

١ ــ واتە ئەگەر ترسایت لە ناپاکیی گەلێك (پەیمانەکەیان) بۆ فڕێ‌بدەرەوە چونیەك ، بەڕاستی خوا ناپاکانی خۆش‌ناوێ ٠

سورة الحشر

بسم الله الرحمن الرحيم

سَبَّحَ لِلّٰهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ. وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١) هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ. مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا، وَظَنُّوا أَنَّهُمْ

---

**سوورەی « حشرە »ە**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوییدایە بە پاکی یادی خوای کرد ، وە ئەو زاڵو کار دروستە(١) خوا ئەو خوایەیە کە بێبڕواکانی خاوەننامەی دەرکرد لەشوێنی خۆیان لە کن یەکەم کۆبوونەوە ، گومانتان نەئەبرد (ئەی مسلمانینە) کە ئاوا دەرئەچن ، (هەروەك) ئەوان وایان ئەزانی کە قەڵاکانیان ئەیانپارێزێ لە (سزای)**

---

**کرد ( ما في السماوات وما في الارض ) هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوییدایە ، واتە هەرچی ژیرە لە بوونەوەردا یادی خوای کرد بە گوفتارو بە کردار ، وە هەرچیش ژیر نییە ، بە زبانی حال یادی خوای خۆی ئەکات ، بەڵکو هەموو ووردیلەیەك لە بوونەوەرا ، بەخۆیو بە کردەوەی ، بەڵگەیەکی ئاشکراو نمایانە لەسەر بوونی خوایەکی ، گەورەی ، بە دەسەڵاتی ، زانای ، دانا ( وهو العزيز الحكيم ) وە ئەو خوایە زاڵو کردار جوانە ، کەوا جوولەکەکانی «بنی نضیر» دەرئەکات لەمەدینە ، دوای ئەوەی کە پەیمانیان شکاند لەگەڵ پێغەمبەرا ٠**

**ئنجا باسی داستانی دەرکردنەکەیان ئەکات ، ئەفەرموێ ( هو الذی ) خوا ئەو خوایەیە ( اخرج الذين كفروا من اهل الكتاب ) کە بێبڕواکانی خاوەننامە : لە جوولەکەکانی «بنی نضیر»ی دەرکرد ( من ديارهم ) لەشوێنی خۆیان ( لاول الحشر ) لەکن یەکەم کۆبوونەوەی پێغەمبەرو هاوڕێیانی بۆ جەنگکردن لەگەڵیانا ، واتە نە مسڵمانەکان بە تەمای ڕۆیینی جوولەکەکانی «بنی نضیر» بوون لەبەر زۆرییو دڕییو سەختی شوێنەکەیان ، وە نە جوولەکەکان بە تەمای ئەوە بوون کە پێغەمبەر بتوانێ دەریانکات ، لەبەر قایمی شوێنەکەیانو سەختی قەڵاو قوللەیان وەکو ئەفەرموێ(ما ظننتم)گومانتان نەئەبرد ئەیمسڵمانەکان (انيخرجوا) کە جوولەکەکانی بنی نضیر لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەما بچنە دەرەوە لە مەدینە ، هەروەك جوولەکەکان خۆیان نەیانئەزانی کەوا زووبەزوو دەرئەکرێن ، وەکو**

مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللهِ ، فَأَتَاهُمُ اللهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ. يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ ، فَاعْتَبِرُوا يَاأُولِي الْأَبْصَارِ (٢) وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا

خوا ، تا (سزای) خوایان بۆ هات لەلایەکەوە کە گومانیان بۆی نەچووبوو ، وە خوا ترسی خستە ناو دڵیانەوە (بەجۆرێك) کەخانۆکانی خۆیانیان وێران ئەکرد بەدەستی خۆیانو بەدەستی مسڵمانەکان ، ئنجا پەند وەرگرن ئەی هوشیارانی جیهان(٢) ئەگەر خوا دەربەدەریی لەسەر نەنووسینایە ، سزای (قورستری) ئەدان لە جیهانا ،

ئەفەرموێ ( وظنوا ) گومانیان وابوو جوولەکەکان کە ( انهم مانعتهم حصونهم ) قەڵاو قوڵلەکانیان ئەیانپارێزێ (من‌الله) لەسزای خوا(فاتاهم‌الله) تاسزای خوایانبۆ هات (من حيث لم يحتسبوا) لەلایەکەوە ، کە خۆیان نەیان‌نەزانی ، وەك هێزی دڵو دەروونیان بێ ، کە بەجارێ ڕووخا ، وە خۆیان بڕوایان بە خۆیان نەما ، وەکو ئەفەرموێ (وقذف في قلوبهم الرعب) خوا ترسی فڕێدایە ناو دڵیانەوە بە جۆرێك کە (يخربون بيوتهم) خانووەکانی خۆیانیان وێران ئەکرد (بايديهم) بەدەستی خۆیان (وايدی المؤمنين) وە بەدەستی مسڵمانەکان ٠

لێرەدا داستانی جوولەکەکانی «بنی نضیر» تەواو ئەبێ ، وەیەکەم قسە کە لەلایەن خواوە بێ بە دوایا ، ئەمەیە کە ئەفەرموێ (فاعتبروا) ئنجا پەند وەرگرن (یااولی الابصار) ئەی هوشیارانی جیهان ، لەم کاتانەدا کەوا هەموو دڵێك دەرگای ئەکرێتەوە ، وە ئامادەی پەند وەرگرتن و دەرس خوێندن ئەبێ ، لەقوتابخانەی بەسەر هاتی ڕۆژگارا ٠ واتە نەناپاکی بکەن وپەیمان بشکێنن ، وەنەپشت بەغەیری خوا ببەستن ، وەك جوولەکەکان ٠

ئنجا باسی ئەوە ئەکات‌کە ئەم ڕۆینی جوولەکانە بۆ خۆیان باش بوو ، چونکە ئەگەر نەڕۆیشتنایە ، ناپاکیی خۆیانیان هەر ئەکرد ، ئەو حەلە دووچاری سزای خراپتر ئەبوون ، ئەفەرموێ (ولولا ان کتب الله علیهم الجلاء) ئەگەر خوا دەر بەدەریی لەسەر نەنووسینایە ، واتە دەربەدەری نەکردنایە (لعذبهم في الدنيا) خوا سزای قورستری ئەدان لەجیهانا ، وەك بێ بڕواکانی قوڕەیش کە لە جەنگی بەدرادا ، زۆریان کوژران و بەدییل گیران ، کە ئەم سزایە شیان جیاوازە لەسزای

وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ (٣) ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللهَ وَرَسُولَهُ ، وَمَنْ يُشَاقِّ اللهَ فَإِنَّ اللهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٤)

وە هەیە بۆ ئەوان لە ڕۆژی دواییدا سزای ئاگر (٣) ئەم سزایە بەهۆی ئەوەوەیە کە پێچەوانەی فەرموودەی خواو پێغەمبەریان‌کرد ، وە هەرکەسێك پێچەوانەی خوا بکات بەڕاستی سزای خوا سەختە (٤) ٠

ڕۆژی دوایی ، وەکو ئەفەرموێ (ولهم في الاخرة) هەیە بۆ ئەوان لەڕۆژی دواییدا (عذاب النار) سزای ئاگری دۆزەخ، واتە ئەم جوولەکانە بەهەمەحاڵ ئەبێ لەئاگری دۆزەخا هەر بسووتێن ، وە ئەمە جێی سەرسوڕمان نییە ، چونکە ئەمانە زۆر دوژمنایەتی‌یان کردلەگەڵ خواو پێغەمبەرا ،وەکو ئەفەرموێ (ذلك) ئەم سزایەی‌کە دووچاریان بوو (بانهم) بە هۆی ئەوەوە بوو کە ئەوان (شاقوا الله ورسوله) پێچەوانەی فەرموودە و فەرمانی خواو پێغەمبەریانکرد ، بەم ڕەنگە ئەو پەیمانەی کە دابوویان بە پێغەمبەر کە لەگەڵیا گۆشەگیربن ، نە یارمەتی بدەنو نە ناپاکیی لەگەڵا بکەن ـ شکاندیان ، وە سەرکردەکەیان ـ کەعبی کوڕی ئەشرف ـ چوو بۆ مەککە وە لەگەڵ قورەیشا پەیمانی بەست لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمبەرا ، پێغەمبەر کە ئەمەی زانی چووە سەریان و دەربەدەری کردن ٠ (ومن یشاق‌الله) وە هەرکەسێك پێچەوانەی فەرموودەو فەرمانی خوا بکات ( فان الله شدید العقاب ) بەڕاستی سزای خوا زۆر سەختە ٠

* * *

وەك لەسەرەتای سوورەتەکەوە باسمانکرد «بنونضیر» کە پەیمانیان شکاند لەگەڵ پێغەمبەرا ، وە بڕیاری جەنگیان دا ، پێغەمبەر دەوری گرتن ، وە فەرمانیدا بە بڕینو سووتاندنی هێندێ لەدارخورماکانیان ، تا دڵیان هەڵکەندرێ لە شوێنەکەیان ، وە بە جەختی جەنگی لەسەر نەکەن جوولەکەکان بەمە ئاگریان تێبەربوو ، وەبانگیان کردە پێغەمبەر ، ووتیان : تۆ لەلایەکەوە ئەڵێیت من پێغەمبەرم ، لەلایەکیشەوە داری بەردار ئەبڕیتو ئەیسووتێنیت ، ئەمە چی بەسەر چیەوەیە ؟ بەڵام پێغەمبەر گوێی نەدانێ ، چونکە هەرچی بکات بەفەرمانی خوایە، لەپاش بڕین و سووتاندنی چەند دارێك ئنجا پێغەمبەر فەرمانی دا بەدەست گێرانەوە لە دار بڕین و دار سووتاندن ٠

مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ (٥) وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ، وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ

ئەوی بڕییتان لە دارخورما ، یا بەجێتانهێشتبێ بە وێستاویی لەسەر بنکەکانیان بە فەرمانی خوا ، وە بۆ ڕەنجەڕۆ کردنی بەدکاران بوو(٥) ئەوی خوا دەست پێغەمبەری خست ( لەماڵی بنی نضیر ) ئێوە بۆ پەیداکردنی هیچ ئەسپو حوشترێکیان تاو نەداوە ، بەلاّم خوا پێغەمبەرانی خۆی زاڵ ئەکات بەسەر

وا دەر ئەکەوێ بەم داربڕینو دار سووتاندنە ، هێندێ لەهاوڕێکانی پێغەمبەر دڵتەنگ بوون وە پێیان ناخۆش بووە ، ئنجا بۆ دڵنیایی ئەوان ، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ، فەرموی(ماقطعتم من لینة)ئەوی بڕییتان لەدارخورمای جوانی تازەپێگەیشتوو (او ترکتموها)یا بەجێتانهێشتبێ(قائمة علی اصولها)بەوێستاویی لە سەر بنکە کانیان ( فباذن الله) ئەوە بەفەرمانی خوا بوو (ولیخزی الفاسقین) وەبۆ ئەوە بوو کە بە دکاران زەبوون و ڕەنجەڕۆ بکات ، وە بەبێ جەنگ بڕۆن ٠

* * *

ئەگێڕنەوە کاتێک کەجوولەکەکانی بنیءنضیر ، بڕیاری ڕۆینیاندا ، هەر چێکیان بوو خستیانە سەرپشتی شەشسەد حوشتر ، وە لەگەڵ خۆیانا بردیان ، بەشی زۆریان چوون بۆشام، ئەوانیکەی تریان ،چوون بۆ«خەیبەر»، خانووەکانیانو ، باخاتی دارخورمایانو سێسەدو چل شمشێر و ، پەنجا زرێ و ، پەنجا کلاّوزرێیا ، بەجێهێشت ، لەگەڵ چەند حوشترێکا ، لەشکرەکە ، داوایانکرد لە پێغەمبەر ، کە ئەم ماڵەیان بەسەردا دابەش بکات ، وەك لەجەنگی بەدردا ، دابەشی کرد بە پێنج بەش ، سیانی بۆ سوارە ، یەکێکی بۆ پیادە ، یەکێکی بۆ پێغەمبەرو خزمانیو هەتیوانو بێچارانو ڕێبواران ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە ، فەرمووی (وما افاء الله) ئەوی کە خوا ڕشتی (علی رسوله منهم) بەسەر پێغەمبەرا لە ماڵی بنی نضیر ، هەر بۆ خواو پێغەمبەرە ، چونکە (فمااوجفتم علیه من خیل ولا رکاب) ئێوە ـئەی لەشکری ئیسلامـ بۆ پەیداکردنی ئەو ماڵە هیچ ئەسپ و حوشترێکیان تاو نەداوە ، وە بە جەنگ نەتانگرتووە (ولکن الله یسلط

عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٦)مَاأَفَاءَاللهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ
أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ

هەرکەسێکا کە بیەوێ ، وە خوا بە سەر هەموو شتێکا توانایە(٦)
ئەوی خوا دەست پێغەمبەری خست لە ( دارایی‌و سامانی ) دێهاتی‌یەکان ، بۆ خواو
پێغەمبەرو خزمان‌و هەتیوان‌و بێچاران‌و رێبوارانە ، تا نەبێ بە گەردانی دەست

رسله) بەلام خوا پێغەمبەرانی خۆی زاڵ ئەکات ( علی من یشاء ) بەسەر هەر کەسێکا کە بیەوێ ( واللە علی کل شیء قدیر ) وە خوا بەسەر هەموو شتێکا توانایە ، واتە خوا پێغەمبەری ناردە سەریان ، وە لەپاش چەند رۆژێ خۆیان بەبێ جەنگ رۆین ، وە باخاتو چەکو خانوویان بەجێ‌هێشت بۆ پێغەمبە ، بەلام پێغەمبەر دابەشی کرد بەسەر کۆچکەران « مهاجرین » و دووکەس لە هەژارانی یارمەتیی دەران «انصار» دا •

لەم ئایەتەوە دەرکەوت کە غەنیمەت ماڵێکە کە لەبێ‌بڕواوە دەست مسلمانان بکەوێ بەجەنگ ، بەلام «فیء» ماڵێکە کە لەبێ‌بڕواوە ، دەست‌بکەوێ بەبێ جەنگ

ئەگێڕنەوە کاتێك کە پێغەمبەر دەستی گرت بە سەر باخاتو جێگاو رێگای بنی‌نضیردا ، یارمەتی دەرانی هەموو کۆکردەوە ، وە زۆر سوپاسی کردن ، کەئەم ماوە دوورو درێژە ، کۆچکەرانیان بردە ماڵی خۆیان ، وە کردنیان بە بەشدار لە ماڵیانا ، ئنجا پێی فەرموون : ئەو ماڵی بنی‌نضیرەی کە خوا خستوویەتە ژێر دەستمەوە ، ئەگەر حەز ئەکەن دابەشی ئەکەم بەسەر ئێوەش و کۆچکەرانیشا ، وە ئەوان ـ وەك جاران ـ بمێننەوە لە ماڵتانا ، وە ئەگەر حەز ئەکەن سامانەکە هەمووی هەر ئەدەم بەوان ، تا بڕۆن لە ناو ماڵ و مناڵتانا • سەرۆکی «ئەوس» سەعدی کوڕی موعازو سەرۆکی «خەزرەج» سەعدی کوڕی عوبادە ووتیان : با لە ماڵەکانیشما نابمێننەوە ، وە هەموو ماڵەکەش هەر بۆ ئەوان بێ ، ئنجا هەموو یارمەتی دەران ووتیان : ئێمەش بەمەرازیین ، پێغەمبەر ئەمەی زۆر پێ‌خۆش بوو، وە نزای بۆ هەموو یارمەتی دەران کرد بەخۆیان و نەوە یانەوە •

ئنجا باسی دابەش کردنی ئەم جۆرە دەست کەوتانە ئەکات ، ئەفەرموێ (ماأفاء اللە علی رسولە) ئەوی خوا دەست پێغەمبەری خست ( من اهل القری) لە ماڵ ومۆڵکی‌ئەهلی ئەودێهاتانەی کەبەجەنگ نەگیراوون (فللە) بۆخوا (وللرسول) و پێغەمبەر (ولذی القربی)و خزمانی پێغەمبەر (والیتامی)و هەتیوان (والمساکین)

وَابْنِ السَّبِيلِ ، كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ ، وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ

به دەست لەناو دەوڵەمەندەکانتانا ئەوی پێغەمبەر ئەتانداتێ وەریگرن ،

وه بێچاران (وابن السبیل) و ڕێبوارانه ، واته دابەش ئەکرێ بەسەر ئەم پێنج دەستەیەدا له هەژاران ، نەك وەك غەنائم دابەش ئەکرێ بەسەر دەوڵەمەند و هەژارانا وەك یەك ٠

ئنجا بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر ئەم دابەشکردنه ، به دانانی دەستوورێکی زۆر گەوره و گرنگ له دەستوورانی ڕێکخستنی ئابووریی و کۆمەڵایەتی له ناو کۆمەڵی مسڵمانانا ، ئەفەرموێ : ئەم ماڵه بەسەر ئەم هەژارانەدا دابەش ئەکرێ نەك بەسەر دەوڵەمەندەکانا ( کی لایکون دولة بین الاغنیاء منکم ) تا ئەو دەست کەوته هەر به دەست دەوڵەمەندەکانتانەوه نەبێ ، وه هەر ئەوان دەستاودەستی پێبکەنو قازانجی لێوەرگرن بەبێ هەژارەکان ٠

ئەم فەرموودەی «کی لا یکون دولة بین الاغنیاء منکم» مەبەستێکی زۆر بەرزو گەورەو گرنگی تیایە ئەویش ئەمەیه که ئیسلام نایەوێ دارایی هەر به دەست کۆمەڵێکی کەمەوه بێ له دەوڵەمەندان ، وه له مافی پاشای ئیسلامه که یاسایەکی وا دابنێ کە بەو یاسایە دارایی دابەش ببێ بەسەر بەشی زۆری مسڵمانانا ، هەروەك خوا لێرەدا «فیء»ی دابەشکرد بەسەر مسڵمانانی هەژاردا بەبێ دەوڵەمەندەکان ٠

له عومەری کوڕی خەتتاب ئەگێڕنەوه که له ئاخرو ئۆخری خەلافەتیا فەرموویەتی : (لو استقبلت من امری مااستدبرت لاخذت فضول اموال الاغنیاء فقسمتها علی فقراء المهاجرین » واته ئەگەر لەسەرەتای کارمەوه بمدیایه ئەوی ئەمڕۆ ئەیبینم زیادەی ماڵی دەوڵەمەندانم وەرئەگرتو دابەشم ئەکرد بەسەر هەژارانی کۆچکەرانا(١) هەروەك به تەواتور ئەگێڕنەوه که حەزرەتی عومەر له خەزێنەی دەوڵەت مانگانەی بڕیوەتەوه بۆ هەژارانو کەفتەکارانو لێقەوماوانی مسڵمانان(٢)

ئنجا بۆ ئەوەی به تەواویی ڕێی دووبەرەکی ببڕێ ، دەستوورێکی تری گەوره دائەنێ بۆ تەشریعی دەستووریی بۆ کۆمەڵی مسڵمانانا ، ئەفەرموێ ( وما اتاکم الرسول ) ئەوی پێغەمبەر ئەتانداتێ ( فخذوه )

---

١ ــ تەماشای تاریخی طبری بکه ج ٣ لاپەڕە ٢٩١ ٠

٢ ــ تەماشای تاریخی عمر بن الخطاب بکه لەلایەن ابن الجوزییەوه ٠

وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا، وَاتَّقُوا اللهَ إِنَّ اللهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٧)

وە ئەوی لێتان قەدەغە ئەکات وازی لیٚبێنن ، وە لەخوا بترسن بەڕاستیی سزای خـوا سەختە(٧) ٠

وەریگرن ( وما نهاكم عنه فانتهوا ) وە ئەوی لێتان قەدەغە ئەکـات وازیلیٚبێنن ( واتقوالله ) وە لەخوا بترسن ( ان الله شديد العقاب )بەڕاستی سزای خوا سەختە ٠

ئەم ئایەتە باسی ئەو جۆرە دەســتکەوتانەی کرد ، کە لـەو بیٚبڕوایانە بەجیٚئەمێنیٚ ، کە لەبەر ناپاکیی خۆیان ناچار ئەکـرێن بە وولاٚت بەجیٚهێشـتن بەبیٚجەنگ ، کە ئـەم جۆرە دەســتکەوتە ئەبیٚ بـە مالی خواو پێغەمبەر ، وە پێغەمبەر خۆی دابەشی ئەکات بە سەر پێنج دەستەدا لەهەژاران ٠ لەپاشا هـۆی ئەم دابەشکردنەی نیشان دا بە دانانی دەستوورێکی زۆر گەورەو گرنگ ، لـە دەستوورانی ڕێکخستنی ئابووریی‌و کۆمەلاٚیەتیی لەناو مسلمانانا ، کە فەرمووی «کی لایکون دولة بين الاغنياء منكم » ٠ هەروەك دەستوورێکی زۆر گەورەشی دانا بۆ تەشریعێکی دەستووریی بۆ کۆمەلی مسلمانان ، کە فەرمووی «وما اتاكم الرسول فخذوه ومانهاكم عنه فانتهوا» ٠

ئەم دوو دەستوورە ،هەرچەند بەبۆنەی ئەم ڕووداوە تایبەتی‌یە ،وە ئەم دابەش کردنی دەستکەوتە کەمـەوە هاتـووە ، بەلاٚم بەڕاستی هەردوکیـان لەم ڕووداوە تایبەتی‌یە تیٚ پەڕیین بۆ دوای خـۆیان بەهەزاران سال ، لە بنیـاتی دەستووری کۆمەلاٚیەتیی ئیسلامی‌دا ٠

دەستووری یەکەم ـ کە دەستووری ڕێکخستنی ئابووریی بوو ـ بەشێکی زۆر نیشان ئەدا لە بنیاتی بیینە «نظرية» ی ئابووریی لە ئیسلاما ، لەم بیینەیەدا ، دان نراوە بەخاوەنێتی تاکیی «ملکیتی فردیی»دا ، بەلاٚم بەو مەرجەی کە لە ســنووری ئەم دەستوورە دەر نەچیٚ ، بەم ڕەنگە ئەومالە نەبیٚ بەگەردان لە ناو دەولەمەندانا، وە هەر جۆرە کردەوە ودابەشکرد نێك سەر بکێشی بۆ ئەوەی کەمالبیٚ بەگەردان لەناو دەولەمەندانا ، ئەوە پێچەوانەی بیینەی ئابووریی ئیسلامی یـە ، هەروەك پێچەوانەی ئامانجی ڕێکخستنی کۆمەلاٚیەتی‌یە، هەموو کاروبارێك لەناو مسلمانانا ، ئەبیٚ وارێك بخریٚ کەئەم گەردانە پەیدا نەکات ، یا ئەگەر لەوەپێش بووبیٚ ، نەیهێلێتەوە ٠

بەلیٚ ئیسلام کەهات ، لەسەر ئەم دەستوورە بنیاتی خـۆی دانا ، بەم ڕەنگە زەکاتی پێویست کرد ، وە لەسەدا ، سالی دوو نیوی دانا لەسەر دەستمایەیەك کەپارەبیٚ ، وە لەسەدا پێنج یادەی دانا لە هەموو بەرو بوومێکی کشتو کالاٚ ، وەبە

لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ

( ئەو دەستکەوتەی لە بنی نضیر گیرا ) بۆ هەژارانی کۆچکەرانە ٠

قەد ئەوە لە ئاژاڵا ٠ وەلە دەستکەوتی جەنگیی «غنیمە» دا ، لەپێنجا چواری دانا بۆ جەنگکەران ، بەهەژارو دەوڵەمەندەوە ، بەلام لە دەستکەوتێك کە بەبێ‌جەنگ بێ « فَيء »ء هەمووی دانا هەر بۆ هەژاران ، وە زەویی‌و زارێك کە بدرێ بە کشتیار بە ساڵانە ، کردیی بە هاوبەشیی « شراکە » لە ناوەندی کشتیارو خاوەن زەوییدا ، وە ڕێی‌داوە بۆ سەرۆکی مسلمانان کە زیادە مالی دەوڵەمەند وەربگرێ و دابەشی بکات بەسەر هەژارانا ، وە بەمانگانەبی دابە مووچە خۆرانی دەوڵەت لەکاتێکاکە خەزێنەی دەوڵەت هیچی تیانەبێ هەروەك سوودودەست بەسەرا گرتن «احتکار» ی قەدەغە کرد ، کەئەم دوانە ، دوو هۆی زۆر گەورەن بۆ ئەوەی کە دارایی هەربمێنێتەوە لە دەستی دەوڵەمەندانا ، کە ئەمەش پێچەوانەی یاسای ئیسلامە .

خۆ لاسە ئیسلام دەستووری ئابووری خۆی دانا لەسەر ئەم بناغە گەورەیە ،وە بەم بنیاتەو گەلێ شتی تر ، مافی خاوەنێتیی تاکیی لە زۆر ڕووەوە بەستەوە ٠

لەمەوە دەرکەوت کە ڕژێم «نظام» ی ئیسلام ، ڕژێمێکی سەر بە خۆیە ، لە ڕژێمی سەرمایەیی « راسمالی » وەرنەگیراوە ، هەروەك ڕژێمی سەرمایەیی لەو وەر نەگیراوە ، چونکە ڕژێمی سەرمایەیی ، بەبێ سوودو دەست بەسەراگرتن، هەرگیز نەبووە و نابێ ، کە ئەم دوانە لەئیسلامەتی دا قەدەغەن ٠

دەستووری دووهەم کە فەرمووی «وما آتاکم الرسول‌فخذوه و مانهاکم عنه فانتهوا » نیشان ئەدا کە سەرچاوەی شەریعەت ، هەر ئەوەیە کە پێغەمبەر بیهێنێ لە خواوە ، ئنجا بە ئایەتی قورئان بێ ، یابە فەرموودەی خۆی بێ ، ئیتر دوای ئەوە نە گەل‌و نە سەرۆکی گەل ، بۆی نییە لێی لابدات ٠

ئەمە بۆ مەسەلەیەك وایە ، کە فەرموودەی خوا یا پێغەمبەری تیا هاتبێ ، بەلام لە شتێکا کە فەرموودەی خوا و پێغەمبەری تیانەبێ ، چارەی ئەوە ، دانانی دەستوورە ، بە جۆرێك کە پێچەوانەی بنیاتێك نەبێ لەبنیاتانی ئیسلام ٠

لە دوای باسی دابەش کردنی دەستکەوتی «فيء» بەسەر خزمان و هەتیوان و بێچارانا ، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە مەبەس لەمانە ، هەژارانی کۆچکەرانە ،کەبێ بڕوایانی قوڕەیش دەریان کردن لە دارایی و سامان و وولاتیان ، ئەفەرموێ : ئەم دەستکەوتەی کەلەبنی نضیربەجێ‌ماوە (للفقراء المهاجرین) بۆهەژارانی کۆچکەرانە

الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللهِ
وَرِضْوَاناً، وَيَنْصُرُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ، أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨)
وَالَّذِينَ تَبَوَّءُو الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ
إِلَيْهِمْ، وَلاَ

---

ئەوانەی کە دەرکران لە وولاتیانو سامانیان ، داوای بەخششو خۆشنوودی خـوا ئەکەن ، وە یارمەتیی خواو پێغەمبەری خوا ئەدەن ، هەر ئەوانن ڕاستگۆیان(٨) ٠
ئەوانەی کە لەپێش کۆچکەرانا جێیـان گرت لەمەینە و کردیان بەبارەگـای بڕوا ، ئـەوی کـۆچ بکـا بـۆ لایـان خۆشـیان ئـەوێ ، وە شـك نابـەن

---

(الذین اخرجوا) ئەوانەی کە دەرکران (من دیارهم) لە جێگاو ڕێگایان (واموالهم) وەلە دارایی و سامانیان ، واتە خـانو مانی خۆیان بـەجێ هێشت بۆخـوا ، وەکو ئەفەرموێ (یبتغون فضلا من‌الله ورضوانا) داوای بەخششو خۆشـنوودیی خـوا ئەکەن ، واتە ئەم کۆچەیان بۆقازانجی دنیا نەبوو ، بەڵکو بـۆ ڕەزای خوا بوو ، (وینصرون الله ورسوله)وە یارمەتی خواو پێغەمبەری‌خوا ئەدەن بەگوفتارو بەکردار، وە بەسەرو بماڵ (اولئك هم الصادقون) هەر ئەوانن راست گۆیانی جیهان ٠

لە دوای مدحی کۆچکەران ، ئنجا مدحی یارمەتی دەران ئەکات ، ئەفەرموێ (والذین) ئەوانەی(تبؤا الدار) کە جێیان گرت لەمەدینە (والایمان)وە جێ‌گیربوون لە سەر بڕوا بەخواو پێغەمبەر (من قبلهم) لەپێش کۆچی کۆچکەرانا بۆمەدینە بە دووساڵ ، واتە ئەم یارمەتی‌دەرانە (یحبون من هاجر الیهم) ئەوی کۆچ بکات بۆ لایان خۆشیان ئەوێ ، بە جۆرێك کاتێك کـە مەککەیی‌یەکان هـاتن بۆ لایـان ، مەدینەیی‌یەکان داباریین بە سەریانا ، وە هەموو یەکێك ئەیویست یەکێك بەرێتە ماڵی خۆی ، بەڵام لەبەرئەوەی کە کۆچکەران لەیارمەتی‌دەران کەمتربـوون ، وە هەموو یەکێك یەکێکی بەرنەئەکەوت ، هاتن قورعەیان کێشا بۆ یارمەتی‌دەران ، بەم ڕەنگە هەرکەسێك ناوی دەربچوایە لەقورعەدا ، ئنجا یەکێکی بەرئەکەوت لـە کۆچکەران ، کە بیباتە لای خۆی ٠

ئەوەتی جیهان جیهانە کۆچ‌وڕەوی وا ، بە کۆمەڵیی ، وە پێشوازی وا ، بەگەرم و گوڕیی ، نەکراوە، تەنانەت زۆر لەویارمەتی دەرانەی کە دووژنیان بوو ژنێکیانی تەڵاق ئەدا بۆ میوانەکەی خۆی تا مـارەی بکات وە بێ‌ژن نـەبێ ( ولا

ـجدونَ في صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أوتُوا، وَيُؤثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ . وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩)

له دڵی خۆیانا هیچ جۆره حەسەدێك بەوەی كه دراویانەتێ ، وه باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیانا با خۆشیان زۆر پێویستبن ، وه كەسێك خـۆی له خووی حەسەد بپارێزێ (به ڕاستی) هەر ئەوانن ڕزگاران(١)

یجدون في صدورهم ) وه شكنابەن لەدڵی خۆیانا (حاجة) هیچ جـۆره حەسەدێك (مما اوتوا)بەوەی كه درا به كۆچكەران لەماڵی بنی النضیر (ویؤثرون علی انفسهم) وەباوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیانا ، وه له دەمی خۆیان و ماڵ و مناڵیان ئەگرنەوه بۆ ئەوان (ولوكـان بهم خصاصه) باخۆشیان زۆر پێویستیان بێ بـەوەی كه ئەیاندەنێ ٠

ئەگێڕنەوه كه پیاوێك دێته خزمەت پێغەمبـەر ، ئـەڵێ : زۆر برسـیی و ماندووم ، پێغەمبەر ئەنێرێ بۆ لای هەموو خێزانەكانی كه چی شكئەبەن بی‌نێرن بۆ ئەم میوانه ، بەڵام لای هیچیان هیچ دەستناكەوێ ، ئنجا پێغەمبەر ئەفەرموێ ڕەحمەتی خوا لەو كەسه بێ كه ئەمشەو ئەم میوانه بباته لای خۆی ٠ یەكێك له یاران ڕاستئەبێتەوه میوانەكه ئەباتەوه بۆ ماڵی خۆی ، وه به ژنەكەی ئەڵێ : ئەمه میوانی پێغەمبەره ، ئیمشەو خزمەتی بكه ، ژنەكەش ئەڵێ : بەخوا هیچمان نی‌یـه بـەشی مناڵـه ووردەكان نـەبێ ، ئـەڵێ : ئێـوارێ مناڵـەكان زوو بـكەره خـەو ، وه نانەكەشت كـه دانـا بـه فێڵێـك چـراكه بكوژێنەرەوه ، با نەزانێ كه من نانی لەگەڵ ناخۆم ، بەیانی میوانەكه كه ئەچێ بۆ لای پێغەمبەر ، پێغەمبەر ئەفەرموێ : ئەمشەو خوا كردەوەی خانەخوێكەی تۆی زۆر لا جوان بووه ، وه دەربارەی ئەو ژن و مێرده ئەفـەرموێ « ویؤثـرون علی انفسهم ولوكان بهم خصاصة » ٠ ( ومن یوق ) وه هەركەسێك خـۆی بپارێـزێ ( شح نفسه ) له خووی حەسەد ( فاولئك هم المفلحون ) هەر ئەوانن ڕزگـارانی جیهان ٠

لەدوای مدحی كۆچكەران و یارمـەتی‌دەران ، ئنجا باسی ئەو مسـڵمانانه ئەكات ، كه چیین به چیین دێن به دوای ئەوانا تا ڕۆژی دوایی ــ كه ئەبێ چۆن

وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ: رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ، وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠)

---

**ئەوانەی هاتنو دێن دوای ئەوان ئەڵێن : خوایە لە ئێمەشو لەو برا دینی‌یانەشمان خۆش ببە کە پێشمان کەوتوون لە بڕوادا ، وە هیچ کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە بەرانبەر بە بڕواداران ، ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەر تۆیت بەخشندەی میهرەبان(١٠) .**

---

بن لەگەڵ هاوڕێیانی پێغەمبەرا ، ئەفەرموێ ( والذين جاءوا ) ئەو مسڵمانانەی کە هاتنو دێن ( من بعدهم ) لەدوای کۆچکەرانو یارمەتی‌دەران تا ڕۆژی دوایی ( يقولون ) ئەڵێن ( ربنا اغفر لنا ) خوایە لەئێمەش خۆشببە ( ولاخواننا الذين )و لەو برا دینی‌یانەشمان خۆشببە کە ( سبقونا بالايمان ) پێشمانکەوتوون لە بڕوادا ، واتە لەپێش ئێمەدا بڕوایان هێناوەو جێیان گرتووە لەناو مسڵمانانا وە بارانی میهرەبانی خۆت ببارێنە بەسەر ئەوانیشو ئێمەشا ( ولاتجعل ) وە پەیدا مەکە ( في قلوبنا ) لەدڵمانا ( غلا ) هیچ جۆرە کینەو رقێك ( للذين آمنوا ) دەربارەی ئەوانەی کە لەپێش ئێمەدا بڕوایان هێناوە ( ربنا ) ئەی پەروەردگارمان ( انك رؤوف ) بەڕاستی تۆ بەخشندەیت ، ئەم پاڕانەوەیەمان لێ‌گیرا بکە ( رحيم ) میهرەبانییت ، لەکۆمەڵی ئەوان بمانخوێنەرەوە .

لەم ئایەتەوە دەرئەکەوێ کە پێویستە لەسەر مسڵمان هەرچی هاوڕێی پێغەمبەر هەیە خۆشی بوێ ، وە ناویان هەرگیز بە سووکیی نەبات ، وە خراپەیان لێ‌ئەکرێ ، وە ئەگەر شتێکی دیی کە بەردڵی نەکەوت ، وا بزانێ کە ئەو هاوڕێیە ، مجتهدێك بووەو بە هەڵەدا چووە .

بە کورتی ئەم چەند ئایەتە نیشان ئەدەن کە مسڵمان ئەبێ :

أ ـ خۆشەویستیی لەناویانا بێ ، وە یارمەتی یەکتریی بدەن لەتەنگانەو ناخۆشیی‌دا ، وە گەورە ئەبێ دەستی بچووكو دەوڵەمەند دەستی هەژارو خوێندەوار دەستی نەخوێندەوار بگرێ .

ب ـ هیچ‌کەسێك حەسادەت بە هیچ‌کەس نەبات ، وە هەموو لەگەڵ یەکا دڵیان پاك بێ .

ج ـ ئەوانەی لەجێگاو ڕێگای خۆیانان ، وە بە دڵنیایی ئەژیین ، ئەبێ بچن بە دەنگ ئەوانەی کە ئاوارەو دەربەدەرن ، وە لەناو خۆیانا دایانکەن ، وە گوزەرانیان بدەنو نەبوونی‌یان لابەرن ،و کەساسیی‌و بێ‌نەوایی‌یان لەسەر هەڵگرن

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن أَهْلِ الْكِتَابِ: لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ

**ئایا سەرنجێکت نەداوە بەلای ئەوانەی کە ناپاکی‌یان کرد ئەڵێن بەو برادەرانەیان کە بێ‌بڕوابوون لــە (جوولەکە) خاوەن نامەکان : ئەگەر ئێوە دەرکــران ئێمەش لەگەڵتانا دەرئەچین ،**

امامی رازیی ئەفەرموێ : ئەم ئایەتە هەموو مسلمانان ئەگرێتەوە ، تا ڕۆژی دوایی ، وە ئەگەیەنێ کە هەرکەسێك ناوی یەکێك لەکۆچکەران ، یا یارمەتی‌دەران، یا بە شوێنا هاتووان « تابعین » یان ببات بە خراپە ، لەم سێ دەستەی بڕوادارانە نی‌یە •

بەم ئایەتە وەك خوا لەژێر پەردەی غەیبەوە لەگەڵ برا شیعەکانمانی بێو ئامۆژگاری یان بکا وایــە •

* * *

دوای ئەوەی کە باسی کۆچکــەران و یارمەتی دەران و بــە شوێنا هــاتوان «تابعین» ی کرد ، وە وێنەیەکی جوان و قەشەنگی گرتن ، وە لە چــوار چێوەیەکی ڕەنگین‌و تریســکەدارا هەڵی‌واسیی بە ژوور ئاسۆی ئاشکراو نمایانــەوە ، ئنجا ئەگەڕێتەوە سەر ئەو باسەی کە سوورەتەکەی تیا هاتۆتە خوارەوە ، بۆ ئــەوەی وێنەی دەستەیەکی سێهەم بگرێ ـ کەناپاکانن فەرمووی «الم تر ٠٠٠» •

کاتێك کەپێغەمبەر دەوری بنی نضیری گرت، سەرۆکی ناپاکەکان لەمەدینە، عبداللە‌ی کوڕی ئوبەی‌ی کوڕی سەلوول ، یەکێکی نــارد بۆ لای جوولەکــەکان ، کە جێگای خــۆیان بەجێ نەهێڵن ، وەجەنگ بکەن لەگــەڵ پێغەمبەرا ، ئەگــەر ئێوە دەرکران ، ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا ئەڕۆین ، وە ئەگــەر محمد داوای لێ کردیین ، کە جەنگی بۆ بکەین لەگەڵ ئێوەدا،بەقسەی ناکەین،وە ئەگەر جەنگی لەگەڵاکردن، ئێمەش ئەدەینە پاڵ ئێوە ، وە ئەچین بە گژ ئەوا ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەفەرموێ (الم تر) ئایا سەرنجێکت نەداوەو ئاوڕێکت نەداوەتەوە (الی الذین نافقوا) بەلای ئەوانەی کە بە دیمەن مسڵمان‌و وەکی‌تر ناپاکی‌یان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرا (یقولون لاخوانهم) بەبرادەرەکانی خۆیــان ئەڵێن (الذین کفروا من أهــل الکتاب) ئەوانەی کە بێ‌بڕوابوون لە خاوەن نامە ، واتە بە جوولەکەکانی بنی نضیر ئەڵێن ـ کە هەر دوکیان لەبێ بڕوایی دا بران ـ : خەفەت مەخۆن (لئن اخرجتم) ئەگەر ئێوە لە وولاتی خۆتــان دەرکران (لنخرجن معکم) بێ‌گومان ئێمەش لەگــەڵ ئێوەدا دەر

وَلا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَداً أَبَداً، وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ. وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١١) لَئِنْ أُخْرِجُوا لا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ. وَلَئِنْ قُوتِلُوا لا يَنْصُرُونَهُمْ. وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الأَدْبَارَ ثُمَّ لا يُنْصَرُونَ (١٢)

---

وە فەرمانبەریی کەس ناکەین دەربارەی ئێوە هەتایە ، وە ئەگەر جەنگتان لەگەڵ کرا بێگومان ئێمە یارمەتی ئێوە ئەدەین ، وەخوا شاهیدیی ئەدات کە ئەوان درۆ ئەکەن (١١) ئەگەر دەرکران ئەوان لەگەڵیانا دەرناچن ، وە ئەگەر جەنگیان لەگەڵکرا یارمەتی‌یان نادەن ، وە ئەگەر (گیرەم) یارمەتی‌یان‌دان ، بێ‌گومان (ئەشکێن‌و) پشت هەڵئەکەن ، لەپاشا یارمەتی نادرێن(١٢)

---

ئەچیین لەم وولاتە (ولا نطیع فیکم احدا ابدا) وە هەرگیز فەرمانبەریی هیچ کەسێك ناکەین لە جەنگ‌کردن لەگەڵ ئێوەدا ، واتە ئەگەر محمد داوای لێ‌کردین کە ئێمەش شانبە شانی مسڵمانەکان جەنگ بکەین لەگەڵتانا ، هەرگیز فەرمانبەریی یان ناکەین (وان قوتلتم) وە ئەگەر جەنگتان لەگەڵ کرا لەلایەن مسڵمانەکانەوە (لننصرنکم) بێ‌گومان ئێمە یارمەتیتان ئەدەین ، ئنجا خوا بە درۆیان ئەخاتەوە ئەفەرموێ (والله یشهد) وە خوا شاهیدیی ئەدا (انهم لکاذبون) کە ئەو ناپاکانە درۆ ئەکەن لەم قسانەدا •

لە دوای ئەوەی کە بە کورتیی بە درۆی خستنەوە ، ئنجا یەك بەیەکیش بە درۆیان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ (لئن اخرجوا) ئەگەر جوو لەکەکانی بنی نضیر لە شاری مەدینە دەرکران (لایخرجون متهم) ناپاکەکان لەگەڵیان ناچنە دەرەوە (ولئن قوتلوا) وە ئەگەر جەنگیان لەگەڵ کرا لەلایەن پێغەمبەرو مسڵمانەکانەوە (لا ینصرونهم) ناپاکەکان یارمەتی‌یان نادەن (ولئن نصروهم) وە ئەگەر گیرەم ناپاکەکان ، دایانە پاڵ جوولەکەکان ، وەیارمەتی‌یان دان ، وە جەنگیین لەگەڵ پێغەمبەر و مسڵانانا ـ کە ئەمە هەرنابێ ـ (لیولن الادبار) ئەوان بەجوولەکەو ناپاکەوە ئەشکێن‌و پشت هەڵئەکەن (ثم لاینصرون) لە پاش ئەو شکانە جارێکی‌تر بنی نضیر یارمەتی نادرێن و سەر ناکەوون ، واتە کە جوولەکەکان لەگەڵ یارمەتی دەرەکانیانا شکان ، ئیتر چۆن جارێکی‌تر خۆیان بە تەنیا سەرئەکەوون •

بە ڕاستیی ئەمە یەکێکە لەو خەبەرانەی کە خوا پێشەکیی داوێتی ، وە بە ڕاست دەرچوو •

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە بۆچی ناپاکەکان یارمەتی جوولەکەکان نادەن ،

لَأَنْتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللهِ. ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ (١٣) لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَاءِ جُدُرٍ. بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ. تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ. ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ (١٤)

( ئەی مسڵمانەکان ) ئێوە لە خوا بەسامترن لە دڵی ئەوانا ، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە ئەوان گەلێکن تێناگەن(١٣) جەنگتان لەگەڵ ناکەن بە کۆمەڵیی مەگەر لەناو دیهاتی قایمکراو ، یا لەپشتی دیوارەوە ، ناکۆکیی ناویان زۆر سەختە ، تۆ وا ئەزانییت کە ئەوان یەکن لەکاتێکا کە بەدڵ پەراگەندەن ، ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوان گەلێکی تێنەگەیشتوون(١٤)

ئەفەرموێ (لانتم) ئێوە ئەی مسڵمانەکان (اشد رهبة) بەسامترن (في صدورهم) لەدڵی ئەو ناپاکانەدا (من الله) لە خوا ، واتە ناپاکەکان ، لە ئێوە زۆرتر ئەترسن لە خوا (ذلك) ئەوەش (بانهم قوم لا يفقهون) لەبەرئەوەیە کە ئەوان گەلێکن تێ ناگەن لەگەورەیی و دەسەڵاتی خوا ، ئەگەر تێ بگەیشتنایە ئەیانزانی کەخوا ئێوەی زاڵ کردووە بەسەر ئەوانا ، وە ئەگەر لە خوا بترسانایە ، لە کەسیتر نەئەترسان .

ئنجا باسی جوولەکەو ناپاکەکان ئەکات ، ئەفەرموێ ( لا يقاتلونكم ) جەنگتان لەگەڵ ناکەن ئەو جوولەکەو ناپاکانە ( جميعا ) بە کۆمەڵیی (الا في قرى محصنة) مەگەر لەناو دێهاتی قایمکراو ( او من وراء جدر ) یا لەپشتی دیوارەوە ، واتە ناتوانن ڕووبەڕوو لەگەڵتانا بجەنگن .

ئنجا هۆی ئەم ترسو زەبوونییەیان باس ئەکات ، ئەفەرموێ (باسهم بينهم شديد ) ناکۆکیی ناوخۆیان زۆر قایمو سەختە ، واتە هەموو لەیەك پچڕاوون ، وە هیچیان بە هیچیانەوە نانووسێن ، وە هەریەکە بەیداخێکی سەربەخۆیی هەڵداوە ، وەکو ئەفەرموێ (تحسبهم جميعا) تۆ وا ئەزانییت کە ئەم جوولەکانە هەموو کۆن ، وە یەك دڵو یەك گیانن (وقلوبهم شتى) لەکاتێکا کە دڵیان پەرێشانو پەراگەندەیە ( ذلك ) ئەوەی کە ووترا (بانهم) بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوان ( قوم لايعقلون ) گەلێکی تێنەگەیشتوون ، نازانن قازانجیان لەچیدایە ، ئەگینا ئارەزووواتی خۆیی «شخصی»یان ئەکرد بەقوربانی قازانجی گشتیی ، وە هەموو یەك دڵو یەك گیان هەڵئەسووڕان بۆ خزمەتی کۆمەڵەو گەلیان .

ئەم ڕووداوی بنی نضیرە وەنەبێ یەکەم ڕووداوبێ لە تەحری خۆیا ، بەڵکو لەپێش ئەم ڕووداوەدا ، ڕووداوی جوولەکەکانی « بنی قینقاع » یش ڕوویدا ، کە

كَمَثَلِ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ قَرِيباً

**(داستانی ئەم جوولەکانە) وەك داستانی ئەوانەن کە لەپێش ئەمانا بوون بە ماوەیەکی کەم**

پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرا شکاند ، وە بەم ئایەتی پاشووە ئیشارەتی بۆ ئەکات ئەفەرموێ : داستانی ئەم جوولەکانی بنی نضیرە (کمثل الذین) وەك داستانی جوولەکەکانی بنی قینقاع وایە (من قبلهم) کە لەپێش ئەمانا بوون (قریبا) بە ماوەیەکی کەم •

ڕووداوی بنی قینقاع لەڕۆژی شەممەی مانگی شەووالا بوو ، کە سەرەتای مانگی بیستەمی کۆچی بوو ، لەدوای جەنگی بدرو پێش جەنگی «احد» •

لە ناوەندی پێغەمبەرو جوولەکەی بنی قینقاعا ، پەیمان بوو کە دەستدرێژیی نەکەن بۆ یەکتریی ، کاتێك کە مسڵمانەکان لەجەنگی «بدر»دا سەرکەوتن بەسەر هاوبەشپەیداکەرەکانی مەککەدا ، جوولەکەکان زۆریان پێناخۆش بوو ، وە ئەترسان کە مسڵمانەکان زۆر بەرزببنەوەو زاڵ ببن بەسەر ئەو مەڵبەندو قەڵەم ڕەوەدا ، وە بەقەد بەرزبوونەوەی ئەوان ، ئەمان نزمببنەوە ، وە بە قەد زاڵ بوونی ئەوان ئەمان زەبوون ببن ، وە بە پێغەمبەر گەیشتەوە کە جوولەکەکانی بنی قینقاع لە چرپەچرپو کۆبوونەوەدان ، پێغەمبەر ئەو پەیمانەی کە لە ناوەندیانا بوو بییری خستنەوە ، وە پێی فەرموون کە ئاگاتان لە پەیمانەکەتان بێ ، وە پێچەوانەی پەیمان ئیش‌نەکەن ، ئەگینا تووشی تۆڵەی خۆتان ئەبن ، جوولەکەکان زۆر بە ڕەقی وەرامی پێغەمبەریان دایەوە ، وە پێیانووت : ئەی محمد وا نەزانییت کە ئێمەش گەلەکەی خۆتیین ؟ بەوە یاخی مەبە ، کە تووشی گەلێکی نەشارەزا بوویت بە جەنگو بە ئاهەنگی جەنگ ، وە تا ئێستا چەند هەلێکت بۆ هەڵکەوتووە ، ئێمە ئەگەر جەنگت لەگەڵ بکەین ، ئەو حەلە تێ ئەگەیت کە ئێمە چیین •

دوای ئەوە ، جوولەکەکانی بنی قینقاع دەستیانکرد بە چڕ نووك گرتنو دەست وەشاندن ، تەنانەت ئەگێرنەوە کەژنە عەرەبێك بە کۆڵێك شتەوە دێتە ناو شاری مەدینە ، وە لەبازاڕی بنی قینقا عدا ئەیفرۆشێ ، وە لەسەر دوکانی جوولەکەیەکی زەڕەنگەر دائەنیشێ ، جوولەکەکان داوای لێئەکەن کە پەچەکەی هەڵبداتەوە ، ئەویش هەڵی ناداتەوە ، ئنجا کابرای زەڕەنگەر بەدزیی ژنەکە وە ، داوێنی کراسەکەی لە پشتەوە ئەبەستێ بە قۆچکەکەیەوە ، کە ژنەکە هەڵئەستێتە پیان کراسەکەی بەرزئەبێتەوە ، وە پاشوپێشی دەرئەکەوێ ، جوولەکەکان دەست

ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ(١٥) كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلإِنْسَانِ : اكْفُرْ. فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ : إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ إِنِّي أَخَافُ اللهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ(١٦) فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا

سەرەنجامی کاری خۆیان چەشت ، وە بۆ ئەوان هەیە سزای پڕ ئێش و ئازار (١٥) (داستانی ئەم ناپاکانە) وەك داستانی شیطان وایە کەبە ئادەمیی ووت : بێ بڕوابە ، کاتێك کەبێ بڕوا بوو (شەیتان) ووتی : من لەتۆ بێزارم ، من لە خوای پەروەردگاری جیهانیان ئەترسم(١٦) سەرەنجامی ئەم دووانە

ئەکەن بە پێکەنیین ، ژنەکەش هاوار ئەکات ، یەکێك لەمسڵمانەکان هەڵ ئەکوتێتە سەر زەڕەنگەرەکە ئەیکوژێ ، جوولەکەکانیش ئەچنە سەر مسڵمانەکە ئەیکوژنەوە ، کەس و کاری مسڵمانەکە ، هاوار ئەکەنە مسڵمانەکان ، وەبەسەر یانا دائەبارێن ، وە ئاژاوە بەرپا ئەبێ ، ئەم دەنگ و باسە بەپێغەمبەر ئەگاتەوە ، خێرا دەوری گەڕەکی بنی قینقاع ئەگرێ ، وەسەرۆکی ناپاکەکان عبداللەی کوڕیئوبەییکوڕی سەلوول ئەچێتە خزمەت پێغەمبەر ، وە بۆیان ئەپارێتەوە ، پێغەمبەر بەمە دەست هەڵئەگرێ کە بڕۆنو مەدینە بەجێبێڵن، وە هەرچێکیان هەیە لەگەڵخۆیانا بیبەن چەکی جەنگی نەبێ ، بەناچاریی ئەڕۆن بۆ شام ، وە هەرچێکیان ئەبێ لەگەڵ خۆیانا ئەیبەن ٠

ئەمە ئەو ڕووداوەیە کە لەپێش بەسەرهاتی بنی نضیردا ڕوویداوە ، وە قورئان تشبیهی حاڵی بنی نضیرو ناپاکەکانی مەدینە لەگەڵ ئەمان و ئەوانا ئەکات بەو ، وە ئەفەرموێ : ئەمانیش وەك ئەوان (ذاقوا) چەشتیان (وبال امرهم) تاڵاوی بەدییو سەرەنجامی کاری خۆیان (ولهم) وە بۆ ئەوان هەیە (عذاب الیم) سزای سەخت و دەردی پڕ ئێش و ئازار ٠

داستانی ئەم ناپاکانەی کە جوولەکەکانیان هەڵ خەڵەتاند ، وە هێنانیانە سەر جەنگ کردن لە گەڵ پێغەمبەرو مسڵمانانا ، لەپاشان هیچ یارمەتی یەکیان نەدان تا بە دەر کردنیان دان (کمثل الشیطان) وەك داستانی شەیتان وایە (اذ قال للانسان) کە بە ئادەمیی ووت (اکفر) بێ بڕوابە (فلما کفر) کاتێك کەبێ بڕوا بوو ( قال ) شەیتان پێیووت ( انی بریء منك ) من لە تۆ بێزارم ( انی اخاف‌الله رب العالمین ) من لەخوای پەروەردگاری جیهانیان ئەترسم ( فکان عاقبتهما ) سەرەنجامی شەیتان و ئادەمیی بێبڕوا ، بوو بەمە

أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدِيْنَ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاءُالظَّالِمِينَ(١٧) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ. وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ،وَ اتَّقُوا اللهَ، إِنَّ اللهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ(١٨) وَلاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ.

---

هەردوولا لە ئاگــرا ئەبن هەتا هەتایە ، وە ئەمەیە ســزای ستەمکاران(١٧) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە لە خوا بترسن ، وە هەموو کەسێك بـا وورد ببێتەوە ( بزانێ ) چیپێشخستووە بۆ پاشەڕۆژی ، وە لەخوا بترسێ ، بە ڕاستیی خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن(١٨) وەك ئەوانە مەبن کە خوایان فەرامۆش کردووە، وە خواش خۆیانی لەبیر خۆیان بردۆتەوە ،

---

(أنهمـا) کە هــەر دولا (في النار خـالدين فيهـا) لەئاگری دۆزەخان بـەئێجگاریی ئەمێننەوە ( وذلك جزاء الظالمين ) وە ئەمەیە سزای ستەمکاران •

* * *

لەدوای باسی جوولەکەی بنی نضیرو ناپاکەکانی مەدینە ، کە ئەمان ئەوانیان دەستخەڕۆ کــرد ، وە سەریان لێشێاونــدن وەك شەیتان ، ئنجا ئامــۆژگاریی مسلمانەکان ئەکات بە خواپەرستیو فەرمانبەرییو دوورکەوتنەوە لەنافەرمانیی ، ئەفەرموێ ( یاایها الذین امنوا ) ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە (اتقوالله) لەخوا بترسن ، وە لەترسی خوا ، خۆتان بپارێزن لەهەموو گوفتارو کــردارێکی خراپ ( ولتنظر نفس ) وە هەموو کەسێك با وورد ببێتەوە ، بزانێ (ما قدمت) چی پێشخستووە (لغد) بۆ پاشەڕۆژی خۆی ، ئنجا ئەگەر چاکەو خواپەرستیيە ، ئەوا سوپاسی خوای لەسەربکات ، وە ئەگەر گوناهو بێفەرمانیيە ، ئەوا پەشیمان ببێتەوە ( واتقوا الله ) وە خۆتان بپارێزن لەهەموو بێفەرمانیيەکی خوا ، چونکە (ان الله خبیر) خوا ئاگادارە ( بماتعملون) بەوەی کە ئەیکەن •

(ولا تکونوا کالذین نسوا الله) ئەی مسلمانینە وەك ئەوانە مەبن کە خوایان فەرامۆش کردووە ، لە جوولەکەو ناپاکانو هاوبەش پەیداکەران •

کەسێك کە خوای بیبرچووەوە ، بێگومان سەرگەردان ئەمێنێ ، نە ئامانجێك لەژیاناو نە نیشانگە «هدف»یەکی بەرزی ئەبێ ، کە جیای بکاتەوە لەگیانلەبەرانی تر ، ئەو حەلە مەردوم ئادەمێتی خۆی لەبیر ئەچێتەوە وە ئاگــای لەپاشــەڕۆژی نامێنێ ، وەکو ئەفەرموێ ( فانساهم انفسهم ) خواش ، خۆیانیانی لەبیر خۆیــان

أُولَـٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (١٩) لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۚ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ (٢٠) لَوْ أَنزَلْنَا هَـٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۚ

---

هەر ئەوانەن بەدکاران(١٩) دانیشتوانی دۆزەخو دانیشتوانی بەهەشت وەك یەك نین ، هەر دانیشتوانی بەهەشت ڕزگارن(٢٠) ئەگەر ئەم قورئانەمان بناردایە بۆ سەر کێوێك (وە تێگەیشتنمان بدایەتێ) تۆ ئەتدیی بەسەر کزییو پارە پارە ، لە ترسی خوا ،

---

بردەوە ، بە جۆرێك کە ئادەمیێتی خۆیان فەرامۆش‌کەن ، وە هەوڵێك بۆ پاشەڕۆژی خۆیان نەدەن ( اولئك هم الفاسقون ) ئا ئەوانە بەدکارانی جیهانن ٠

ئنجا بە ئایەتی پاشوو نیشان ئەدا کە ئەم دوو دەستەیە ، یەکێکیان بەهەشتییو ئەویتریان دۆزەخیین ، ئەفەرموێ ( لایستوی اصحاب النار واصحاب الجنة ) دۆزەخییو بەهەشتیی وەك یەك نین ، واتە لەڕۆژی دوایی‌دا نابن بە یەك ، بەڵکو ( اصحاب الجنة هم الفائزون ) هەر دانیشتووانی بەهەشت رزگارن .

ناو ی دۆزەخیی نەبرد ، واتە شایستەی ناوبردن نیین ٠

* * *

لە دوای باسی ناپاکیی ناپاکان و فرو فێڵی جوولەکەکان ـ ئەوە بوو لە ئایەتی پێشوودا فەرمانی‌دا بەبروا داران‌بە خۆپاراستنو لەخوا ترسان ، ئنجا لێرەدا باسێکی کورتی قورئان ئەکات ، کە پێشەوایەکی گەورەو ئامۆژگارێکی کاریی‌گەرە ، بە هەزارو یەك زمان قسە لەگەڵ مەردوم ئەکات ، ئەو قورئانەی کە پێویستە هەموو کەسێك پڕ بەدڵ سەری بۆ دابنەوێنێ ، وە هەموو دڵێك لە ترسی فەرموودەکانی بێتە لەرزە ، وە کاری تێ‌بکا ، ئەو قورئانەی ئەگەر بمان ناردایەتە خوارەوە بۆ سەر کێوێکی گەورەی سەخت ، وە ئەو کێوە وەك ئادەمیی لێی تێ‌بگەیشتایە ، بێ گومان پارچە پارچە ئەبوو لەترسی خـوا ، وەکو ئەفەرموێ (لوانزلنا هذا القران) ئەگەر ئەم قورئانانەمان بناردایەتە خوارەوە(علی جبل)بۆ سەر کێوێك،وە ئەو کێوە تێگەیشتنمان بدایەتێ وەك ئادەمیی (لرایتە)تۆ ئەو کێوەت ئەدیی (خاشعا)بەسەر کزییو (متصدعا من خشیة الله) پار پارە لەترسی خوا ، وە لەترسی ئەو هەڕەشە و گوڕەشانەی کە تیایەتی ، وە ئەو ئامۆژگارییو بەڵێنانەی کە بە هەزارویەك ڕەنگ ئەیدا بە گوێچکەی مەردوما ، کەچی ئادەمی بەم هەمووزە بوونی‌یەوە کەهەیە

وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (٢١) هُوَ اللَّهُ
الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ
(٢٢) هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ

---

ئەم جۆرە نموونانــە ئەیـانهێنینــەوە بۆ مــەردوم بەڵكــو بیير بكەنــەوە(٢١)
هەر ئەوە ، ئەو خوایەی کــە بێجگە لەو خوای تر نی‌یە ، دانایە بە هەموو نهێنیو
ئاشكرایەك ، ئەوە بەخشندەی میهرەبان(٢٢) • ئەوە ئەو خوایەی كە بێجگە لەو
خوای تر نی‌یە

---

گوێی ناداتێ ( وتلك الامثال ) وە ئەم جۆرە نموونانە ( نضربها للناس ) ئەیان هێننەوە لە قورئانا بۆ مەردوم (لعلهم یتفكرون) بەڵكو بییربكەنەوەو تێ‌بگەن •

* * *

لەدوایی باسی گەورەیی قورئان ، ئنجا خوا باسێكی گەورەیی خۆی ئەكات ، بە ناوبردنی چەند ناوێكی پاكو پیرۆزی خۆی ، كە هەر ناوێكیان جــۆرە كارێك ئەكات لەم بوونەرە ، وە لەژیانی ئادەمیی‌دا ، ئەفەرموێ ( هوالله الذي ) هەر ئەوە ، ئەو خوایەی ( لااله الاهو ) كە بێجگە لەو خوای تر نی‌یە •

بەمە ئەخاتە دڵمانەوە كە ئەبێ تاقە یەك خوا بناسین ، وە خواپەرستیی هەر بۆ یەك خوا بكەین ، وە ڕوومان هەر لەیەك خوابێ ، وە هەر ئەو تاقە خــوایەیە ئیش‌كەر لەسەرەتای جیهانەوە تا ڕۆژی دوایی •

( عالم الغیب والشهادة ) دانایە بە هەموو شتێكی نهێنیو ئاشكرا •

ئەمە تێمان‌ئەگەیەنێ كە خوا ئاگادارە بە هەموو شتێك ، وە هەرچی بكەین یا بێ‌ڵێین خوا ئاگای لێ‌یە ، مەردوم كە ئەمەی زانی ئەوحەلە ، چەندە بە ئاشكرا خۆی ئەپارێزێ لەگوناه بە دزییشەوە ئەوەندە خۆی ئەپارێزێ ، وە بەم هەستەوە خوو ئەگرێ •

( هو الرحمن الرحیم ) ئەوە بەخشندەی میهرەبان •

بەمە دڵنیایی ئەڕوێ لەدڵانا ، وە ترازووی ترس‌و دڵنیایی بەرانبەری یــەك ئەوێستن ، وە هیچ لایەكی لاسەنگ نابێ ، وە هەموو كەسێك تێ‌ئەگات كە خــوا دوژمنی بەندەی خۆی نی‌یە ،وە زیانی بۆ كەس ناوێ ، بەڵكو هەمیشە چاودێرێتی ، وە ڕێ‌نموونیی ئەوی ئەوێ •

( هوالله الذي ) هەر ئەوە ، ئەو خوایەی ( لااله الاهو ) كە بێجگە لەو خوای تر نی‌یە

الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ، سُبْحَانَ اللهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٢٣) هُوَ اللهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ

پاشاو پاکو سالمو دڵنیاکەرەو چاودێرو زاڵو گەورەی فەرمانڕەواو شایستەی هەموو گەورەیی‌یەکە ، پاکیی بۆ خوایە لەو هاوبەشانەی کە بۆی دائەنێن(٢٣) هەر ئەوە خواو دروستکەری هەموو شتێکو هێنەرەروو ،

ئەمەی ووتەوە ، چونکە بنیاتی هەموو سیفەتەکانی ترێتی ·

( الملك ) پاشای بە دەسەڵاتە ·

بەمە ئەڕوێ لە دڵا ، کە هەر خوا بە دەستەڵاتە ، وە هیچ کەسێکی تر هیچی بەدەست نی‌یە ، ئەوحەلە ، هەموو کەسێك یەك‌گەورەو سەرۆکی ئەبێ ، وە یەك‌کەس ئەناسێ کە خوایە ·

( القدوس ) پاکە لەهەموو ناتەواویی‌و نەنگێك .

بەمە پورتەوێکی پاکیی‌و ڕووناکیی بڵاو ئەبێتەوە لەدڵو دەروونی مەردوما ·

( السلام ) پاکە لەهەموو زەبوونی‌و نەنگێو کەم‌وکووری‌یەك ·

بەمە پۆرتەوێکی دڵنیایی‌و ئاشتی ، دڵی مەردوم ڕووناك ئەکاتەوە ، ئەوحەلە، تۆوی خراپی لەدڵیا سەوز نابێ ، وە لەگەڵ هەموو کەسێکا وەك فریشتە ، بێ‌وەی ئەبێ ·

( المؤمن ) دڵنیاکەرەوەی بڕوادارانە ·

بەمە دڵنیایی ئەڕوێ لەدڵانا ، چونکە تا بڕوا بەخوا زۆرتربێ ، بێ‌ترسیش زۆرتر ئەبێ ·

( المهیمن ) ئاگاداری هەموو جیهانو جیهانیانە ·

( العزیز ) زاڵو بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکا ·

( الجبار ) گەورەو فەرمانڕەوایە لەهەموو ڕوویەکەوە ، وە کەس بەسەریا زاڵ نابێ ·

( المتکبر ) شایستەی هەموو گەورەیی‌یەکە (سبحان‌الله)پاکیی بۆ خوایە ( عما یشرکون ) لەو هاوبەشانەی کە بۆی دائەنێن .

(هوالله) هەر ئەوە خواو کەسی تر نی‌یە ·

(الخالق) دروست کەری هەموو شتێکە بەو ڕەنگەی کەخۆی ئەیەوێ ·

(الباریء) چۆنی ویست وای ئەهێنێتە ڕوو ·

الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى ۚ يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٢٤)

وێنەبەخش ، بۆ ئەوە هەموو جۆرە ناوێکی جوانو پاك ، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویی‌دایە ستایشی ئەو ئەکەن ، وە هەر ئەوە زاڵی کردار جوان(٢٤)

( المصور ) ڕەنگو وێنە بەهەموو شتێك ئەبەخشێ ، بەجۆرێك کە جیاببنەوە لەیەك .

(له الاسماء الحسنى) بۆ ئەوە هەموو ناوێکی جوانو پاك ( يسبح له مافي السماوات والارض) هەرچی لـە ئاسمانە کان و زەویی دایە ستایشی ئـەو ئەکەن ( وهو العزيز ) وە هەر ئەوە زاڵ لە ئـەرزو ئاسمانا ( الحكيم ) کردار جوانە ، وە هەڵەی تیانی‌یە .

ئەم ئایەتانە کۆمەڵەیەك لەناوی خوای گەورەیان تیایە کە لە هیچ لایەکی ترەوە ئەوەندە ناوی خوای تیا کۆ نەبۆ تەوە .

خوای گەورە(٩٩) ناوی هەیە کە هەمووی لەقورئانـا ناو براوون ، لە بەر ئەوەی کە خوا خۆی تاکو تەنیایە ناوەکانیشی‌بۆ یەتاکە کەئەمانەن (الله ،رحمن، رحيم ، ملك ، قدوس ، سلام ، مؤمن ، مهيمن ـ عزيز ـ جبار ـ متكبر ـ خالق ـ بارىء ـ مصور ـ غفار ـ قهار ـ وهاب ـ رزاق ـ فتاح عليم ـ قابض ـ باسط ـ خافض، رافع ـ معز ـ مذل ـ سميع ـ بصير ـ خكيم ـ عدل ـ لطيف ـ خبير ـ حليم ـ عظيم ـ غفور ـ شكور ـ على ـ كبير ـ حفيظ ـ مقيت ـ حسيب ـ جليل ـ كريم ـ رقيب مجيب ـ واسع ـ حكيم ـ ودود ـ مجيد ـ باعث ـ شهيد ـ حق ـ وكيل ـ قوى ـ متين ـ ولى ـ حميد ـ محصى ـ مبدى ـ معيد ـ محيى ـ مميت ـ حى ـ قيوم ـ واجد ـ ماجد ـ واحـد ـ صمد ـ قادر ـ مقتدر ـ مقدم مواخـر ـ اول ، آخر ، ظاهر ـ باطن ـ والى ـ متعالى ـ بر ـ تواب ـ منتقم ـ عفو ـ رءوف ـ مالك الملك ـ ذو الجلال والاكرام ـ مقسط ـ جامع ـ غنى ـ مغنى ـ معطى ـ مانع ـ ضار ، نافع ، نور ، هادى ، بديع ، باقى ، وارث ، رشيد ، صبور .

## سوورەی «ممتحنە» یە

مەدەنییە ، ١٢ ئایەتە ، ٣٤٨ ووتەیە ، ١٥١٠ پیتە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لە ساڵی هەشتەمی کۆچیی، دوای پەیمانی «حدیبیە» ،ئەوە بوو،بێ بڕواکانی مەککە ، پەیمانەکەی حدیبیە یان شکاند ، پێغەمبەر ناچار بوو بڕیاری دا بەرانبەر بەوە ، کە شاری مەککە بگرێ ، وە ئەم دومەڵە دەرکا ، وە فەرمانیدا بەمسڵمانەکان کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ ، وە بە هێندێکی تایبەتی فەرموو بەپەنهانیی لە کۆچکەران و ئەوانەی کەلە جەنگیبە دردا بەشدار بوون : کەئەچیین‌بۆ سەر مەککە کە یەکێك لەوان «حاطب»ی کوڕی «ابی بلتعە» بوو ۰

حاطب هەرچەند لە مسڵمانە کۆنەکان ، وە لە کۆچکەران‌و یارانی بەدر بوو، بەڵام ئادەمیی هێندێ جار لەهێندێ لاوە ، زەبوونیی ڕووی تێ ئەکات ، وەهێندێ کار ئەکات کە نەئەبوو بیکردایە ، لەبەر ئەوە کاغەزێك ئەنووسێ بۆ دانیشتووانی مەککە ، کە پێغەمبەر لەم ڕۆژانەدا دێتــە سەرتان ، ئاگاتان لەخــۆتان بێ ، وە بەدزییەوە ئەیدا بە ژنە مەککەیی‌یەکی هــاوبەش پەیدا کەر «مشرك» کە ناوی «سارە» وە لەو حەڵەدا لەمەدینە ئەبێ ، وە ئەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ مەککە ، وە دە دیناریشی ئەداتێ ، ژنەکە کاغەزەکە ئەبات ، لە پاشا خوا پێغەمبەر ئاگادار ئەکات، خێرا پێغەمبەر امامی علی و پێنج کەسی تر ئەنێرێ ، وەپێیان ئەڵێ بچن بۆفلان شوێن ۰ لەوێ تووشی ژنێك ئەبن ئەچێ بۆ مەککە ، کاغەزێکی پێیە لێی‌بسەنن ، وە ئەگەر کاغەزەکەی نەدانێ بی کوژن ، ئەمان کە ئەڕۆن لەو شوێنەی کە پێغەمبەر ئەفەرموێ بە ژنەکە ئەگەن ، وە داوای کاغەزەکەی لێ ئەکەن ، ئەڵێ کاژم پێ‌نییە، امامی علی هەڕەشەی لێ‌ئەکا بە کوشتن ، ئنجا کاغەزەکە لەناو پرچیا دەردێنێ‌و ئەیانداتێ ، وەکاغەزەکە ئەبەن بۆ پێغەمبەر ، خێرا ئەنێرێ بەشوێن حاطبا ، وە لێی ئەپرسێ ئەم کاغەزەت بۆ نووسیوە ؟ ئەویش ئەڵێ : بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەوەتی مسڵمان بووم نە بێبڕوابوومەتەوە و نە ناپاکیم کردووە ، بەڵام من لە قوڕەیش نییم ، وە لەمەککە کەس شك نابەم ژنەکەم‌و منالەکانم نەبێ ، ئــەم هەموو کۆچکەرانەی کە لەگەڵتان هەموو کەس‌وکارو خزم‌و خوێشیان هەیە لەمەککە،

سورة الممتحنة

بسم الله الرحمن الرحيم

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَولِيَاءَ، تُلقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ، وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ، يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللهِ رَبِّكُمْ،

---

**سوورەی «ممتحنه» یه**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە ، دوژمنانی من و خۆتان مەگرن بە دۆست ، دۆستایەتی خۆتانیان بۆ ئەنێرن لە کاتێکا کە ئەوان بێ بڕوا بوون بەو ئایینەی کە بۆتان هاتووە ، پێغەمبەرو ئێوە دەرئەکەن ، (لەبەرئەوەی) کە بڕوا ئەهێنن بە خوای پەروەردگارتان**

---

**کە ئاگاداریی ماڵ و منداڵەکانیان ئەکەن ، لەبەر ئەوە من ویستم بەمە خزمەتێکی قوریش بکەم ، تا زۆر ئازاری منداڵەکانم نەدەن • پێغەمبەر فەرمووی ، ڕاست ئەکەیت ، امامی عومەر فەرمووی : ئەمە ناپاکە بالەملی بدەم، پێغەمبەر فەرمووی: چۆنی ئەکوژییت ؟ ئەمە لە یارانی بەدرە ، تۆ چوو زانییت ،بەڵکوخوا مژدەی دابنێ کەچی ئەکەن بیکەن ، من لێتان خۆش بووم • امامی عومەر هەردوچاوی پڕ ئەبێ لە ئاو ، وە ئەفەرموێ : خوا و پێغەمبەر باشتری ئەزانن ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ، ئەم سوورەتە هاتەخوارەوە، بۆئامۆژگاریی مسڵانان کەنهینی پێغەمبەر نەخەنە ژێر دەستی بێبڕوایانەوە ، فەرمووی(یا ایها الذین امنوا)ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە (لاتتخذوا عدوی وعدوکم اولیاء) هەرگیز بێ بڕوایان ـ کەدوژمنی من و ئێوەن ـ مەیان کەن بە دۆستی گیانیی خۆتان (تلقون الیهم بالمودة) دۆستایەتیی خۆتانیان پێشکەش ئەکەن ، واتە دەنگ و باسی پێغەمبەریان بۆ ئەنێرن لە کاتێکا کە نابێ دوژمنانی پێغەمبەر ئەو دەنگ و باسە جەنگی یانە بزانن •**

**ئنجا زۆر و ستەمی ئەو دوژمیانەیان بیر ئەخاتەوە بەرانبەر بە خۆیان و بە دینیانو بە پێغەمبەریان ، ئەفەرموێ (وقد کفروا) لەکاتێکا کە دوژمنەکانیان بێ بڕوابوون (بماجاءکم) بەوەی کە بۆتان هاتووە لەلایەن خواوە (من الحق)لەئایینی ڕاست و دروست کە ئیسلامە (یخرجون الرسول وایاکم) پێغەمبەر و ئێوە دەرئەکەن لە وڵاتی خۆتان ، وەهیچ هۆیەک نییە بۆ ئەمە ، تەنیا ئەوە نەبێ (ان تؤمنوا بالله ربکم) کە ئێوە بڕواتان هێناوە بە خوای پەروەردگارتان •**

إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَاداً فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي ، تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ . وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ ، وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١) إِن يَثْقَفُوكُمْ تَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً ، وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ

---

**ئەگەر ئێوە بۆ ڕەزای منو جەنگ کردن لە ڕێی منا دەرچوون (لە وولات وامەکەن) ، رازو نهێنیـیان پێ‌ئەڵێن بە دۆستایەتی ، وە من داناترم ( لەخۆتان ) • بەوەی ئەیشارنەوە و ئاشکرای ئەکەن ، وە هەر کەسێک لە ئێوە کاری وابکات ، بێ گومان ڕێی ڕاستی وون کردووە (١) ئەگەر ئێوەیان چنگ کەوێ هەردوژمنە کەی جارانن ، وە دەست**

---

**واتە دوای ئەم هەموو زۆرو ستەمو دەستدرێژی‌یەی کە ئەوان کردویانەو هیچیان تیا نە هێشتۆتەوە ، ئیتر ئێوە چۆن ئەم خۆشەویستی‌یە ئەکەن لەگەڵ ئەو هاوبەش پەیدا کەرانە دا (ان کنتم خرجتم) ئەگەر وەختی خۆی ئێوە دەرچوون لە وولاتی خۆتان (جها داڨي سبيلي) بۆ جەنگ کردن لە ڕێی منا (وابتغاء مرضاتي) وە بۆ داواکردنی خۆشنوودی من وا مەکەن •**

**واتە ئەگەر ڕاستنەکەن کە بۆ خوا و جەنگ لەڕێی ئەوا کۆچتان کردووە، وە دەستتان لەماڵومناڵتان هەڵگرتووە ، ئەم جۆرە دۆستایەتی‌یانە مەکـەن لەگەڵ ئەم دوژمنە بێ‌بڕوایانەتانا •**

**ئنجا هەڕەشەیەکی سووکی پەنهانی‌یان لێ‌ئەکات ، ئەفەرموێ (تسرون‌اليهم) رازو نهێنی یان بێ ئەڵێن ، وە دەنگ و باسی تایبەتی یان بۆ ئەنێرن (بالمودة) بە دۆستایەتی ( وانا اعلم ) وە من دانا ترم لەخۆتان ( بما اخفيتم ) بەوەی کە پەنهانی ئەکـەن و ئەیشارنـەوە (وما اعلنتم) وە بـەو بیانوانەی کـە ئاشکرای ئەکەن و ئەیانهێننەوە (ومن يفعله منكم)وە هەرکەسێك لەئێوە کاری وابکات ، وە دەنگو باسی پێغەمبەرو مسڵمانان بنێرێ بۆ دوژمن (فقد ضل) بەڕاستی وونی کردووە (سواء السبيل) ڕێی ڕاست •**

**ئەم دوژمنانی ئێوەیە کە هەلێکیان بۆ هەڵکەوێ بە سەرتانەوە نارۆن ، وەکو ئەفەرموێ (ان يثقفوكم) ئەگەر تووشتان‌ببن (يكونو الكم اعداء) دوژمنایەتی خۆیان ئاشکرا ئەکەن ، هەروەک کـردویانە (ويبسطوا اليكم ايديهم) وە دەستیان درێژ**

وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ . وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ ( ٢ ) لَنْ تَنْفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ . يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ . وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ(٣) قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ

و زمانتان بۆدرێژ ئەکەن بەخراپی، وەئارەزوو ئەکەن کە خۆزگە بێبڕوابوونایە(٢) نە خزمانتانو نە منالآنتان قازانجتان پێناگەیەنن ، لە ڕۆژی دواییدا (خوا ئێوەو خزمەکانتـان لـە یەك) جیا ئەکاتـەوە ، وە خـوا بینایـە بەوەی کـە ئەیکەن(٣) بەڕاستیی شایستە بوو بۆ ئێوە ( ئەی مسلمانینە ) کە پەیڕەوییەکی باشی

ئەکەن بۆتان بە جنێوو هەڕەشە کردن ، کـەواتە دۆستایەتی و قسە بۆ نار دنیـان کەڵکی نییە •

لە مانە لە هەمووی خراپتر ئەوەیە کە ئەفەرموێ (وودوا لوتکغرون) ئارزوو ئەکەن کە کاشکێ بێبڕوابوونایە ، ئەو حەلە لەڕۆژی دواییدا بە سـزای دۆزەخ ئەگـەن : وە ئیتـر کـەس فریـاتان ناکـەوێ لـەکەسـو کـارو خـزمو خـوێشو مـاڵو منالتـان ، وەکـو ئـەفـەرمـوێ ( لـن تنفعکـم ارحامکم ) نە خوێشـانتان قازانجتـان پێئـەدەن ( ولا اولادکـم ) وە نـە منالانتـان ، لە وانەی کە بۆ پارێزگاریی ئەوان ، دۆستایەتی بێ بڕوایان ئەکەن ، وە بۆ ئەوان لە ڕێی ڕاست لائەدەن (یوم القیامة یفصل بینکم) لە ڕۆژی دوایی داخوا جوێیەتی ئەخاتە ناوەندی ئێوەو ماڵومناڵو کەسوکارتانـەوە ( واللہ بما تعملون بصیر ) وە خوا بینایە بەو دۆستایەتییەی کە ئەیکەن لەگەڵ دوژمنانی ئایینتانا •

* * *

ئنجا خوا ئاوورێك لە مسلمانەکان ئەداتەوە بـە لای حەزرەتی ابراهیـمو گەلەکەیەوە ، کە گەلێکی خاوەن بڕوابوون بە تاکوتەنیایی خوا ، وە گەلێك بوون هیچ جۆرە سەروساختێکیان لەناوانەبووە ، سەروساختی بیروباوەڕ نەبێ ، ئنجا خوا ئەیەوێ کە مسلمانەکان ، ابراهیمو ئومەتەکەی بکەن بەسەرمەشقی خۆیان ، لەهێزی بڕواو خۆڕاگرتن لەبەر باری ڕۆژگارو یەخە هەڵتەکاندن لەباوکو براو کەسوکارێك ، کە لەبیروباوەڕا لەگەڵیانا نەبن ، وەکو ئەفەرموێ (قد کانت لکم) بە ڕاستیی شایستە بوو بۆ ئێوە ، ئەی مسلمانینە ( اسوة حسنة ) کە پەیڕەوییەکی

فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ . إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ ! إِنَّا بُرَآءُمِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ ، كَفَرْنَا بِكُمْ ، وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللهِ وَحْدَهُ . إِلاَّ قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ : لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ . وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللهِ مِنْ شَيْءٍ .

---

**ابراهیمو ئەوانەی کەلەگەڵیابوون بیکەن، کە ئەمانە بەگەلەکەی خۆیان ووت: ئێمە بێزارین لەئێوەو لەوانەی کە ئەیانپەرستن لەغەیری خوا ، ئێمە بێبڕواین بە ئێوە ، وە پەیدابوو لەناوەندی ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتیو ناخۆشیی بە ئێجگاریی تا کاتێك کە بڕوا بە خوای یەکەتا ئەهێنن ، مەگــەر لەو قسەیەی کە ابراهیم بە باوکی ووت : داوای لێخۆشبوونت بۆ ئەکەم ، وە من هیچم بەدەست نی یە لەلایەن خواوە بۆ تۆ**

---

باش بکەن ( في ابراهيم ) لەم قسانەی ابراهیم ( والذين معه ) و ئەوانەی کە لە گەڵیــا بوون لەبــڕواداران ( اذ قالوا ) کە ابــراهیمو بڕوادارەکانی گەلەکــەی ، ووتیان ( لقومهم ) بە بێبڕواکانی گەـەکەیان ( انا برآء منكم ) بەڕاستیی ئێمــە بێزارین لە ئێوە (ومـا تعبدون) وە لەو بتانەی کە ئەیانپەرستن (من دون الله) لە غەیری خوا ٠

ئنجا ئەم بێزاری یە راڤە ئەکات ، ئەفەرموێ ( كفرنا بكم ) ئێمە بێبڕواین بە ئایینی ئێوەو پەرستراوی ئێوە ( وبدا بيننا وبينكم ) وە پەیدابوو لەناوەندی ئێمەو ئێــوەدا (العداوة والبغضاء) دژمنایەتیو ناخۆشی (ابدا) بــە ئێجگاریی ، واتە دژمنایەتی هەمیشەیی لە ناوەندمانــا ئەمێنێتەوە (حتى تؤمنوا) تا کاتێك کە ئێوەش وەك ئێمە بڕوا ئەهێنن ( بالله وحده ) بەخوای تاکوتەنیا ، واتە لەهەموو قسەکانیا چاو لە ابراهیم بکەن ( الا قول ابراهيم لابيه ) مەگەر لەم قسەیەیا نەبێ کە بە باوکی هاوبەش پەیداکەری خۆی ووت ( لاستغفرن لك ) داوای لێخۆشبوونت بۆ ئەکەم ، ئەمەش لەسەر ئەوەبوو کە باوکی بەڵێنی پێدابوو کە بڕوای پێبێنێ ، وە دەســت لــە بتپەرســتی هەڵگرێ ، لەپاشا کە بــۆی دەرکــەوت کە دەســتی لێهەڵنەگرتووە ، بەخەی خۆی لێهەڵتەکاند ٠

لەگەڵ ئەمیشە ابراهیم کاتێك کە داوای لێخۆشبوونی کرد بۆ بــاوکی ، پێیووت : (وماأملك لكمنالله منشيء)من هیچم بەدەست نی یە بۆ تۆ ، وە ناتوانم

رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا ، وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا ، وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٤) رَبَّنَا لاَ تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا، وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا ، إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٥) لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُوا اللهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ .

---

ئەی پەروەردگارمان ، هەر لەسەر تۆیە پشتو پەنامان ، وە هەر بۆ لای تۆ روومان وەرگێڕاوە ، وە هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە(٤) ئەی پەروەردگارمان ، مەمانگێڕە بە مایەی گومڕایی بۆ بێبڕوایان ، وە لێمان خۆشبە ئەی پەروەردگارمان ، بە ڕاستی هەر تۆیت زاڵو کاردروست(٥) بێگومان هەیە بۆ ێوە لە ابراهیمو بڕوادارەکانیا ، بە پەیڕەوییەکی چاك ، بۆ کەسێك کە هیوای ببێ بە خواو ڕۆژی دوایی ،

---

هیچشتێکت لێدووربخەمەوە لەسزای خوا •

ئنجا باسی ئەو پاڕانەوەیە ئەکات ، کە ابراهیمو بڕوادارەکانی کردیان ، لەکاتێکا کە پشتیان هەڵکرد لەگەڵەکەیان ، وە پەنایان برد بەخوا ، ئەفەرموێ ووتیان ( ربنا ) ئەی پەروەردگارمان ( علیك توکلنا ) هەر لەسەر تۆیە پشتو پەنامان ( والیك انبنا ) وە هەر بۆ لای تۆ ڕوومان وەرگێڕاوە ( والیك المصیر ) وە هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوەی هەموو کەسێك لەڕۆژی دواییدا ( ربنا ) ئەی پەروەردگارمان ( لاتجعلنا ) مەمانگێڕە (فتنة للذین کفروا) بە مایەی سەرگەردانیی بۆ بێبڕوایان واتە ئەوانمان بەسەرا زاڵمەکە،تا ئەوە ببێ بە مایەی گومڕاییان، چونکە ئەوحەلە ئەڵێن : ئەگەر بڕوا بە خوا ، چاودێرییو ئاگاداریی بڕواداری بکردایە ، خوا ئێمەی زاڵ نەئەکرد بەسەر ئەوانا ، ئەم قسە هەڵەیە زۆرجار بەدڵی بێبڕوایانو نادانانا دێ ، لەکاتێکا کە ستەمکار زاڵ ببێ بەسەر بڕوادارا ، وە نارەوایی بەسەر ، ڕەوادا ( واغفر لنا ) وە لێمان خۆش ببە ( ربنا ) ئەی پەروەردگارمان ( انك انت العزیز ) بەڕاستی هەر تۆیت زاڵ ( العکیم ) و کار دروست •

دووبارە هاتەوە سەر ئامۆژگاریەکەی پێشوو کە مسڵمانەکان ، ابراهیمو بڕوادارەکانی بکەن بەسەرمەشقی خۆیان ، فەرمووی ( لقد کان ) بەڕاستی هەیە (لکم) بۆ ئێوە ئەی مسڵمانینە (فیهم) لە ابراهیمو بڕوادارەکانیا ( اسوة حسنة ) بەیڕەوییەکی باش ( لمن کان یرجوالله ) بۆ کەسێك کە هیوای ببێ بە خوا (والیوم الاخر)و پاداشی ڕۆژی دوایی ، واتە هەرکەسێك بە تەمای ئەمانە بێ لە مسڵمانان ،

وَمَنْ يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ (٦) عَسَى اللَّهُ أَنْ يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُمْ مِنْهُمْ مَوَدَّةً . وَاللَّهُ قَدِيرٌ . وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٧)

**وە هەرکەسێك ڕوو وەرگێڕێ بە ڕاستی هەر خوایە بێنیازو شایستەی ستایش(٦) شایەد خوا دۆستایەتی بگێڕێ لە ناوەندی ئێوەو ئەوانەی دژمنایەتیتان لەگەڵ کردوون لەوان ، خوا بە توانایە ، وە خۆشبوو میهرەبانە(٧)**

با چاو لە ابراهیمو بڕوادارەکانی بکات ( ومن یتول ) وە هەرکەسێك ڕوو وەرگێڕێ لە فەرمانی خوا ، وە دۆستایەتی بکات لەگەڵ دژمنانی خوادا ، زیان بەکەس ناگەیەنێ بەخۆی نەبێ ، وە خوا هیچ پێویستێکی بەو نییە وەکو ئەفەرموێ ( فان‌الله هو الغنی ) بەڕاستی هەر خوایە بێنیاز ( الحمید ) شایستەی ستایش ٠

کاتێك کە خوا جڵەوگیریی مسڵمانەکانی کرد لە دۆستایەتی بێبڕوایان ، وە ابراهیمی خەلیلو بڕوادارەکانی گەلەکەی بە نموونە هێنایەوە ، ئیتر مسڵمانەکان بە تەواویی کەس‌وکارە بێبڕواکانیان فەرامۆش کرد ، ئنجا بۆ ئەوەی کە پەتی دڵیان بە تێجگاریی نەپچڕێ ، وە وا نەزانن ، کە هیچ ئومێدێك نەماوە ، بۆ بەیەك‌گەیشتنیان ، هیوایەکی دانێ ، وە بە چرپە مزگێنییەکی پەنهانیی دا بەگوێچکەیانا ، کە ئەگونجێ بەم زووانە خزمەکانتان لە مەککە مسڵمان ببن ، وە دەست لەهاوبەشیی پەیداکردن بۆ خوا هەڵگرن ، وە جارێکی تر بە برایەتی کۆ ببنەوە لەسەر خوانی بڕوا ، هەر وەك جاران کە هەموو کۆبوون لەسەر خوانی بێبڕوایی ، فەرمووی (عسی الله ان یجعل) شایەد خوا بگێڕێ (بینکم وبین الذین) لە ناوەندی ئێوەو ئەوانەی (عادیتم) دژمنایەتیتان لەگەڵ کردوون (منهم) لە بێ بڕوایانی مەککە (مودة) دۆستایەتی (والله قدیر) وە خوا تەوا نایە ، لەسەر ئەوەی کە دژمن بکا بە دۆست (والله غفور) وە خوا خۆشبووە لەوانەی کە تائێستا دۆستایەتیی کردووە لە گەڵ ئەو هاوبەش پەیدا کەرانەدا (رحیم) میهرەبانە

بە ڕاستی خوا ئەم مزگێنییەی هێنایە دیی ، وە یارمەتی مسڵمانانی دا بۆ گرتنی مەککە ، وە لەدوای ئەوە ، هەموو دانیشتوانی مەککە و دەوروبەری مسڵمان بوون ، وە بەبرایەتیی دیین و دنیا ، ئەم جارە بەیەك گەیشتن ٠

* * *

لاَ يَنْهَاكُمُ اللهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِن دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ، إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ

---

**خوا جڵەو گیریی تان ناکات لەوانەی کە جەنگیان لە گەڵ نە کردوون لەدینا ، و دەریان نەکردوون لە وولاتتان ـ کە چاکەیان لەگەڵ بکەن وودادیان لەگەڵ بنوێن بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە دادگەرن(٨) خوا جڵەوگیریی‌تان هەر لەوا ئەکات کە جەنگیون لەگەڵتانا لەسەر ئاین ، وە دەریان کردوون لە وولاتتان ، و یارمەتی‌یان داوە لە سەر دەرکردنتان (وە جڵەوگیریی‌تان ئەکات) لەوەی ک دۆستایەتی‌یان لەگەڵ بکەنو بە دۆستیان دابنێن ٠**

---

ئەگێڕنەوە کە ئەسما ئەی کچی ابو بکر ، دایکێکی تەلاقدراوی هاوبەش پەیدا کەری ئەبێ ، وە ئەم دایکەی لە مەککەوە دێ بۆ لای لەمەدینە ، وە چە دیاری‌یەکیشی بۆ ئەهێنێ ، بەلام ئەسمائە ، لەترسی ئایەتەکانی پێشوو ، ناوێر گلی بداتەوە ، بەڵکو هەرنایەڵێ بچێتەماڵەوە لای ، لە پاشا ئەسما ئەبە عائشە خوشکی ئڵێ ـ کە خێزانی پێغەمبەر بووە ـ کەلەپێغەمبەر بپرسێ بزانێ چی بکات ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم دوو ئایەتە دێتە خوارەوە ، ئەفەرموێ (لا ینهاکم الله) خ جڵەوگیرییتان ناکات ئەی مسڵمانینە ( عن الذین ) لەوانەی ( لم یقاتلوکم کە جەنگیان لەگەڵ نەکردوون ( في الدین ) لەدینا ( ولم یخرجوکم ) وە دەریا نەکردوون (من دیارکم) لەوولاتتان ٠ جڵەگیرییتان ناکا لەوەی (ان تبروهم) چاکەیان لەگەڵ بکەن ( وتقسطوا الیهم ) وە دادیان لەگەڵ بنوێنن ( ان‌الله یحب المقسطین) بە ڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە دادگەرن ٠

لەمەوە دەر ئەکەوێ ، کەپێویستە لەسەر مسڵمانان کردەوە یان باش ڕەفتاریان جوان بێ لەگەڵ ئەو کەسانەی کە مسڵمان نیین ، وە بە ئارام دائەنیش لەوولاتیانا ، وە زیان بە کەس ناگەیەنن ٠

(انما ینهاکم الله) ئەوی خوا جڵەگیریی تان لێ بکات (عن الذین) هە لەوانەیە کە (قاتلوکم) جەنگیان لەگەڵ کردوون (في الدین) لە دینا ، واتە بەهۆ مسڵمان بوونتانەوە جەنگی وون لەگەڵتانا ( واخرجوکم ) وە دەریان کردوون ( دیارکم) لەوولاتتان (وظاهروا) وەیارمەتیان‌داوە (علی اخراجکم) لەسەر دەرکردنت لەجێگاو ڕێگاتانا ـ جڵەوگیریی‌تان ئەکات ( ان تولوهم ) لەوەی کە دۆستایەتی‌ی

وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٩)

وە هەرکەسێك دۆستایەتی‌یان بکات ئەوانەن ستەمکار(١)

لەگەڵ بکەن (ومن یتولهم) وەهەر کەسێك دۆستایەتیی بکا لەگەڵیانا (فاولئك‌هم الظالمون) ئا ئەوانە ستەمکارن •

کاتێك کە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە ، پێغەمبەر جوابی نارد بۆ ئەسمائەی کچی ئەبوبکر ، کەدایکی بەرێتە ماڵەوە لای‌خۆی، وە دیاری یەکانی لێ گل‌بداتەوە، وەخزمەتی بکات و زۆر ڕێزی بگرێ •

ئەم دوو ئایەتە هەرچەند بۆ ڕووداوێکی بچکۆلانەی خۆیی «شخصی» هاتوو نەتە خوارەوە ، بەڵام قورئان لێرەدا بەم هۆیەوە ، دەستوورێکی ئیسلامیی گەورەش دائەنێ بۆ پەیوەندیی «علاقە» ناو دەوڵەتان ، لەناوەندی مسلمانان و بێگانانا ، وە دۆژمنایەتی تەرخـان نەکات هەر بۆ کاتی دەستدرێژیی‌و زۆرو ستەم ، بـەڵام لە کاتێکا کە دەستدرێژیی‌و زۆرو ستەم نەبوو ، ئەوحەلە کاتی چاکەو دادو نەرم‌و شلی‌یە •

بەڵێ ئیسلام دینی سەلام‌و ئاشتی‌یە ، دینێکە ئەیەوێ هەموو ئادەمیی لەژێر سێبەرەکەیا بحەسێتەوە ، وە هەموو وەك برا بژیین بە خۆشیی‌و خۆشبەختی ، هیچ شتێك ئیسلام لانـادات لەم ڕێ‌یە ، دەستدرێژیی‌و دوژمنایـەتیی نەبێ لەگـەڵ مسلمانانا ، ئەوحەلە ڕووبەڕووی ئەوێستێ ، بەڵام ئەگەر بە ئاشتیی ژیان لەگەڵیا ئەوحەلـە ، ئیسـلام دوژمنایەتی ناکـا ، بەڵکو لەکاتی دوژمنایەتیشـا بەشـی باشەڕۆژی تیا ئەهێڵێتەوە ، بە دادو چاوپۆشیی‌و لێخۆشبوون •

* * *

ئەگێڕنەوە کە لە سـاڵی شەشـەمی کۆچیی لە « حدیبیە » کـە پێغەمبـەرو بێ‌براواکانی قـورەیش ڕێکـەوتن ، وە ڕێکەوتن‌نامەیەکیان نووسـی ، وە لـەم ڕێکەوتن‌نامەیەدا نوسـرا : کە هەرکەسـێك لەقورەیشـ بچێ بۆ لای محمـد ، بی‌نێرێتەوە ، با مسلمانیش بێ ، وە هەرکەسێك لەلای محمدەوە بچێ بۆ نـاو قورەیش نەی‌نێرنەوە ، هێشتا پێغەمبەر لە حدیبیە نەگەڕابووەوە ، چەند ژنێکی مسلمان لە مەککەوە هاتن بۆلای پێغەمبەر ، بە بیری کۆچکردن لە مەککەوە بۆ مەدینە ، وە چەند قورەیشی‌یەك بە دوایانا هاتبوون کە پێغەمبەر بیان‌نێرێتـەوە بە پێی ڕێکەوتن‌نامەکەیان ، بەڵام لەبەرئەوەی کە ڕێکەوتن‌نامەکە ڕوون نەبـوو

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ . اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ ، فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ . لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ . وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ .وَآتُوهُمْ مَا أَنْفَقُوا.

---

**ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر ژنانی مسڵمان هاتن بۆ لاتان بە کۆچکەریی، تاقیيان بکەنەوە ، خوا داناترە بە بڕوای ئەوان ، ئنجا ئەگەر زانیتان کە بڕوادارن ئەوە مەیاننێرنەوە بۆ لای ( مێردە ) بێبڕواکانیان ، نە ئەو ژنانە بۆ ئەو بێبڕوایانە دروستو نە ئەو بێبڕوایانەش بۆ ئەو ژنانە دروستن ، وە ئەوەی (مێردەکان) خەرجیان کردووە ، بیيانده‌نەوە ،**

---

**لەباسی ژنا ، وە هەر مەبەس پیاوبوو ، ئەم دوو ئایەتە هاتە خوارەوە ، فەرمووی (یا أیها الذین امنوا) ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە (اذا جاءکم المؤمنات) ئەگەر ژنانی مسڵمان هاتن بۆ لاتان ( مهاجرات ) بە کۆچکەریی (فامتحنوهن ) تاقیيان بکەنـــەوە ، بـــەم ڕەنگە سوێندیان بـــدەن کە هاتنیان لەبـــەر ناحـــەزیی مێردەکانیان ، یا لەبەر خۆشـــەویستی یەکێکی تـــر ، یا بۆ قازانجێکی جیهـــانیی نەبووە ، بەڵکو هەر بۆ ڕەزای خواو پێغەمبەرو ئیسلامەتیيە .**

**ئەم تاقیکردنەوەیە هەر لەسەر دیمەنە ، چونکە ئەوی لەدوو توێی دڵو دەروونایە ، خوا نەبێ کەسی تر نایزانێ ، وەکو ئەفەرموێ (الله اعلم) خوا داناترە لەئێوە ( بایمانهن ) بە بڕوای ئەو ژنانە ( فان علمتوهن مؤمنات ) ئنجا ئەگـــەر زانییتان کە بڕوادارن ، وە بۆ خوا کۆچیان کردووە ، ( فلا ترجعوهن الی الکفار ) ئیتر مەیاننێرنەوە بۆ لای مێردە بێبڕواکانیان ، نـــەوەك پەشیمان بکـــرێنەوە بەهۆی زەبوونیيانەوە ( لاهن حل لهم ) نە ئـــەو ژنانـــە حەڵاڵن بۆ ئەو مێـــردە بێبڕوایانە ( ولا هم یحلون لهن ) وە نە ئەو مێردانەش حەڵاڵن بۆ ئەو ژنانە ٠**

**لە دوای بـــاسی جیاکردنەوەی ژنو مێـــرد لەیەك ، ئنجا بـــاسی بریتیدان «تعویض» ئەکات بە ڕەنگێك کە دادو یەکسانیی تیابێ ، بەم ڕەنگە بریتیيەکە ، ئەدرێتەوە بە مێردە بێبڕواکە ، لەباتیی ئەو مارەییيەی کە داوێتی بە ژنەکەی هەر وەك ئەدرێتەوە بەمێردی مسڵمان نرخی ئەوەی کە داوێتیی بەژنە بێ بڕواکەی لە مارەیی، وەکو ئەفەرموێ (واتوهم) بدەن بەمێردەکان (ماانفقوا) ئەوەی کەخەرجیان کردووە لە مارەیی ٠**

وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ، وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ ، وَاسْأَلُوا مَا أَنْفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنْفَقُوا ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ، وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١٠)

**هیچ گوناهێکتان لەسەر نیيە کە ئەم ژنانە مارە بکەن کاتێك کە مارەییيەکانیان بدەنێ، دەستمەگرن بەسەر ژنانی بێبڕوادا (کە خاوەننامە نەبن)ئێوە داوای ئەوە بکەن کە خەرجتان کردووە ، ئەوانیش با داوای ئەوە بکەن کە خەرجیان کردووە ، ئەمە فەرمانی خوایە ، بڕیار ئەدا لەناوتانا ، وە خوا دانای کردارجوانە(١٠)**

**(ولاجناح علیکم) هیچ گوناهێکتان لەسەر نیيە (ان تنکحوهن) کە ئەم ژنە کۆچکەرانە مارە بکەن (اذااتیتموهن اجورهن) کاتێک کە مارەییيەکانیان بدەنێ ، تا ئەو مارەییيە بدەنەوە بەمێردە بێ بڕوا کانیان ، واتە دوای ئەوەی کە مارەییيەکەتان بۆ دانەوە دروستە بۆ مسلمانان ئەوژنە مسلمانە کۆچکەرانە مارە بکەن ، ئنجا ئاخۆ ئەم ژنانە عدەیان لەسەربێ ؟ یا هەر لەسەر سکپڕە بە دانانی سکەکەی ؟ وە ئەگەر عدەیان لە سەرە ، ئایا عدەی تەڵاقیان لە سەرە ـ کەسێ پاکو پیسیيە ـ یا هەر نۆرە حەیزێك بەسە ـ کە نیشانەی نەبوونی سکە ـ ؟ ئەمە جێی دوو بەرەکی یە لەناو زانایانی شەرعدا ٠**

**(ولا تمسکوا بعصم الکوافر) دەست مەگرن بەسەر ژنانێکی بێبڕوادا کە خاوەن نامە نەبن ، واتە ئەگەر خۆتان مسلمان بوون ، وە ژنەکانتان بەبێ بڕوایی مانەوە ، یاهەر دوکتان مسلمان بوون ، بەڵام لە پاشا ژنە کانتان بێ بڕوا بوونەوە، گلیان مەدەنەوەو نکاحەکانیان ڕامەگرن ، بەڵکو زوو تەڵاقیان بدەن ، ئنجا لەم حەڵەدا (واسالوا) داوا بکەن ئەی مسلمانینە لەو بێ بڕوایانەی کە ئەیانەوێ ژنەبێ بڕواکانتان مارە بکەن (ما انفقتم) ئەوەی کەتیاتانا خەرج کردووە لە مارەیی (ولیسالوا) با بێبڕواکانیش داوابکەن لە مسلمانەکان (ماانفقوا) ئەوەی خەرجیان کردووە لەمارەیی ژنە کانیان کە مسلمان بوون (ذلکم) ئەوی ووترا (حکم‌الله) فەرمانی خوایە ( یحکم ) بڕیار ئەدا ( بینکم ) لە ناوتانا (والله علیم) وە خوا دانایە بەقازانج و سوودتان (حکیم) کردار جوانە**

**لێرەدا ئەگونجێ یەکێك مسلمان ببێ و کۆچ بکا بۆ مەدینە و ژنەکەی بەبێ**

وَإِنْ فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُمْ مِثْلَ مَا أَنْفَقُوا، وَاتَّقُوا اللهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ (١١) يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ

**ئەگەر لە دەستتان چوو یەکێك لە ژنەکانتان (بەرۆینیان) بۆ لای بێبرواکان ، ئێوەش تۆڵەتان لێسەندن ٠ ئنجا ئەوحەلە بدەن بەوانەی کە ژنەکانیان رۆیوە ، ماننلی ئەوەی کە خەرجیان کردووە ، وە بترسن لەو خوایەی کە ئێوە برواتان پێهێناوە(١١) ئەی پێغەمبەر کاتێك کە ژنانی بروادار هاتن بۆ لات کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن**

---

بروایی بمێنێتەوە لەمەککەدا ، یاژنو مێردێك هەردوکیان مسلمان بېنو کۆچ بکەن بۆ مەدینە ، لە پاشا ژنەکەبێ بروابێتەوە و بگەرێتە بۆناو بێبراکانی مەککە وە ئەو بێ بروایانەی کە ئەو ژنانە مارەئەکەن ، مارەیی‌یەکەیان نەدەنەوە بەمێردە مسلمانە کانیان ، ئنجا قورئان چارەی ئەمە ئەکات ، ئەفەرموێ (وان فاتکم) ئەگەر لە دەستتان چوو ئەی مسلمانینە (شیء) یەکێك (من ازواجکم) لە ژنەکانتان ، بەم رەنگە چوو (الی الکفار) بۆلای دوژمنە بێ بڕواکان ، وە مارەیی‌یەکەی نەدایەوە بەمێردە مسلمانەکەی (فعاقبتم) ئێوەش لە هەر وەختێکا جەنگیین لەگەڵیانا وماڵتان لێ گرتن ، ئەبێ لە وماڵە ئەو مارەیی‌یە بدرێ بەو مێردە مسلمانانە ، پێش ئەوەی کە ئەو ماڵە دابەش بکرێ بەپێنج بەشەوە ، وەك هەموو ماڵێك کە لە جەنگا بگیرێ ، وەکو ئەفەرموێ ( فاتوا الذین ذهبت ازواجهم ) ئنجا بدەنەوە بەو مسلمانانەی کەژنەکانیان رۆیوون بۆناو بێبرواکان (مثل ماانفقوا) ماننلی ئەوەی کە خەرجیان کردووە لەمارەیی ژنەکانیانا ( واتقوالله الذي ) وە بترسن لەو خوایەی ( انتم به مؤمنون ) کە ئێوە برواتان پێهێناوە ٠

* * *

کاتێك کە مەککە گیرا ، هەرچی پیاوان بوو ئەهاتن بۆ خزمەت پێغەمبەرو مسلمان ئەبوونو پەیمانیان لەگەڵ ئەبەست کە یارمەتی بدەن ، دوای ئەوان ئنجا ژنان ئەهاتنو پەیمانیان لەگەڵ ئەبەست ، وەکو ئەفەرموێ ( یاایها النبي ) ئەی پێغەمبەر ( اذا جاءك المؤمنات ) کاتێك کە ژنانی مسلمان هاتن بۆ لات ( یباعنك ) پەیمانت لەگەڵ ببەستن لەسەر ئەمانەی دوایی :

عَلَى أَنْ لاَ يُشْرِكْنَ بِاللهِ شَيْئاً، وَلاَ يَسْرِقْنَ وَلاَ يَزْنِينَ ، وَلاَ
يَقْتُلْنَ أَوْلاَدَهُنَّ ، وَلاَ يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ
وَأَرْجُلِهِنَّ، وَلاَ يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ، فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ
اللهَ، إِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٢)

---

لەسەر ئەوەی کەهیچشتێك نەکەن بەهاوبەشی خواو دزیی‌وداوێن‌پیسی نەکەن‌ومنالیان نەکوژن‌و بوختان هەڵنەبەستن لەناوەندی دەستوپێیانا ، وە بێ‌فەرمانییت نەکەن لەکاری باشا ، ئنجا پەیمانیان لەگەڵ ببەستە ، وە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە بە ڕاستی خوالێ‌خۆشبوو میهرەبانە(١٢) ٠

---

١ ـ ( علی ان لایشرکن ) لەسەرئەوەی کە هاوبەش پەیدا نەکەن ( باللہ شیئا ) بۆ خوا بەهیچ جۆرێ ٠

ب ـ ( ولایسرقن ) دزیی نەکەن ٠

ج ـ ( ولایزنین ) داوێن پیسی نەکەن ٠

د ـ ( ولایقتلن اولادهن ) منالی خۆیان زیندەبەچاڵ نەکەن ، وەك جاران کردویانە ، یا سك لەبار خۆیان نەبەن ٠

هـ ـ ( ولایاتین ببهتان ) بوختانێك نەکەن ( یفترینه ) کە هەڵیببەستن ( بین ایدیهن وارجلهن ) لەبەینی دەستو پێی خۆیانا ، واتە منالی حەرامزادە نەهێنن‌و بیکەن بە منالی مێردەکانیان ٠

و ـ ( ولایعصینك ) بێ‌فەرمانییت نەکەن ( فی معروف ) لەکاری باشا ٠ ئنجا ئەگەر بەم مەرجانە پەیمانیان لەگەڵتا بەست ( فبایعهن ) تۆش پەیمانیان لەگەڵ ببەستە ( واستغفر لهن الله ) وە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لە خوا ( ان‌الله غفور ) بەڕاستیی خوالێخۆشبوو ( رحیم ) میهرەبانە ٠

ژنەکان لەکاتی پەیمانەکەدا داوایانکرد لەپێغەمبەر کە دەست بخاتە ناو دەستیانەوە وەك پیاوەکان ، فەرمووی : من دەست ناخەمە ناو دەستی ژنی بێگانەوە ، وە بەبێ‌دەستخستنە ناو دەست پەیمانی لێ‌وەرگرتن ٠

* * *

لەسەرەتای سوورەتەکەوە ئەوەبوو خوا جلەوگیریی مسلمانەکانی کرد لە دۆستایەتی بێبڕوایان ، جا لەبەر گرنگیی ئەم مەسەلەیە بۆ مسلمانان‌و دەوڵەتی ئیسلام ، دووبارە جلەوگیریی مسلمانانی کردەوە ، لەدۆستایەتی بێبڕوایان

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَوَلَّوْا قَوْماً غَضِبَ اللهُ عَلَيْهِمْ . قَدْ يَئِسُوا مِنَ الآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ (١٣)

**ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە گەلێک کە خوا خەشمی لێ گرتووە مەیکەن بە دۆستی (گیانیی)تان ، بەڕاستی ئەوان نائومێد بوون لە (پاداشی) ڕۆژی دوایی ، هەروەک بێ بڕوایان نائومێدن لە مردووی ناو گۆڕان (١٣) .**

بەجووله کەوگاوور و هەموو جۆرە دوژمنێکی ئایینییەوە ، فەرمووی (یاایها الذین امنوا) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە (لاتتولوا) دۆستی مەکەن (قوماغضب الله علیهم) لەگەڵ گەلێکا کــە خوا خەشمی لێ گرتوون (قد یئسوا) بەڕاستیی نائومێد ماوون (من‌الاخرة) لەپاداشی ڕۆژی دوپی ، واتە بەتەمای نیین (کمایئسس الکفار) هەروەک نائومێد بوون بێ بڕوایان (من اصحاب القبور) لەمردووی ناو گۆڕان ، واتە چەندە بەتەمای مردووی ناو گۆڕەکانن کە زیندووبینەوە و بێنەوە جیهان ، ئە وەندەش بەتەمای ڕۆژی دوایین کە تۆڵە ، یاپاداش بدرێنەوە بەباشیی .

سورة الصف

بسم الله الرحمن الرحیم

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ، وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١)

---

سوورەی « صف » ە

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

بە پاکیی یادی خوای کرد هەرچی لە ئاسمانەکانو لەزەوییدایە ، وە ئەو زاڵو کار دروستە(١)

---

سوورەی « صف » ە

مدنییە ، ١٤ ئایەتە ، ٢٢١ ووتەیە ، ٩٠٠ پیتە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سەرەتای ئەم سوورەتە ، دائەمەزرێنێ بە ستایشی خوا لەلایەن هەموو بوونەوەرەوە ، ستایشێکی وا کە دڵی مسڵمانان بێدار بکاتەوە بە گەورەیی خوا بە جۆرێکی وا کە شەرمی لێ‌بکات ،وە تا بتوانێ گوفتارو کرداری لەیەك جیانەبن ، فەرمووی (سبح‌لله) بەپاکیی یادی خوایکرد (مافي السماوات ومافي‌الارض) هەرچی لە ئاسمانەکانو لەزەوییدایە، واتە مانگ کە بەدرێژایی جیهان بەدەوری زەوییدا ئەسوورێتەوەو ، زەویی کە بە دەوری ڕۆژا ئەسوورێتەوەو ، ڕۆژ کە بە دەوری کاکەشانا ئەسوورێتەوەو ، کاکەشان کە بە دەوری مەرکەزی بوونەوەرا ئەسوورێتەوە ، ئەم سووڕانەوەیە خواپەرستییو تەسبیحاتی خوایە کە بە زبانی حاڵ ئەیکەن ، وەك سووڕانەوەی مسڵمانان بە دەوری کەعبەدا چۆن خواپەرستییو پاڕانەوەیە ، سووڕانەوەی ئەمانیش وایە ٠

( وهو العزیز ) وە ئەو زاڵ ( الحکیم )و کاردروستە ٠

ئنجا نەنگ ئەگرێ لەمسڵمانان ، لەسەر کردەوەی هێندێکیان ، وە سەرکۆنەیان ئەکات زۆر بە سەختی ، نەفەرموێ «یا ایها الذین آمنوا» ٠

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ؟(٢) كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ (٣) إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ (٤)

---

ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بۆچی ئەوی ئەیڵێن نایکەن(٢) زۆرمایەی خەشمی خوایە کە قسەیەك بڵێنو نەیکەن(٣) بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش‌ئەوێ کە بە ڕیزە جەنگ ئەکەن لە ڕێی خوادا ئەڵێیت کۆشکێکی قایمی چەسپیوون(٤)

---

ئەگێڕنەوە کە کۆمەڵێك لە مسڵمانان پێش‌ئەوەی جەنگ پێویست بکرێ لەڕێی خوادا ، ئەڵێن : ئەگەر بمانزانیایە ، چ کردەوەیەك لای خوا خۆشەویستو پەسەندە ، ئەمانکرد تا ئەمردیین ، خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ : خۆشەویست‌ترینی کردەوە دوای بڕوا بەخوا ، جەنگ‌کردنە لەڕێی خوادا ، لەگەڵ ئەوانەی کە بڕوایان نی‌یە ، کاتێك کە جەنگ پێویست‌کرا ، ئەو مسڵمانانەی کە ئەو قسەیەیان کردبوو ، زۆریان پێ‌گرانبوو ، وە ئەیانووت ــ وەك قورئان ئەگێڕێتەوە ــ « ربنا لم کتبت علینا القتال ؟ لولا اخرتنا الی اجل قریب » واتە ئەی پەروەردگارمان ! بۆچی جەنگت لەسەر پێویست کردیین ؟ بۆ دوات نەخستین تا ماوەیەکی نزیك ؟ کە کاتی مردنی خۆمانە ٠

ئنجا خوا سەرکۆنەیان ئەکات بەم ئایەتە کە بەم بۆنەیەوە هاتۆتە خوارەوە ، ئەفەرموێ ( یاایها الذین آمنوا ) ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە ( لم‌تقولون ما لاتفعلون ) بۆچی ئەوی ئەیڵێن نایکەن ؟ واتە گوفتارو کردارتان لەیەك جیاوازە ( کبرمقتا عندالله ) مایەی خەشمی خوایە ( ان تقولوا ما لاتفعلون ) کە شتێك بڵێن کە نایکەن ٠

ئنجا خوا بە تایبەتی بڕیاری خۆی ئەدا ، لەو کارەی کە مسڵمانان گوفتارو کرداریان تیا جیاوازە ــ کە جەنگ‌کردنە لەڕێی خوادا ــ وە باسی ئەو شتە ئەکات کە خوا پێی‌خۆشە ، ئەفەرموێ ( ان‌الله ) بەڕاستی خوا ( یحب الذین یقاتلون ) ئەوانەی خۆش‌ئەوێ کە جەنگ ئەکەن ( في سبیله ) لەڕێی خوادا ( صفا ) شان بەشانی یەك ( کانهم ) ئەڵێیت ( بنیان مرصوص ) کۆشکێکی قایمی چەسپیوون لەبەردو چیمەنتۆ ، وە پاچو پێمەڕە کاریان تێ‌ناکات ٠

مەبەس لەمە ، ئەوە نی‌یە کە جەنگ‌کەران نزییك بن لەیەکەوە ، بەڵکو

وَ إِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي وَ قَدْ تَعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُمْ؟ فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللهُ قُلُوبَهُمْ وَ اللهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ (٥) وَ إِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ : يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُمْ . مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ ،

---

بیبر بکەرەوە کاتێك کە مووسا بە گەلەکەی خۆی ووت : ئەی گەلی خۆم بۆچی ئازارم ئەدەن لەکاتێکا کە ئەزانن من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە ؟ کاتێك کەلایان دا خواش دلی وەر گێران ، وەخوا ، ڕێ نموونیی گەلی بەدکار ناکات (٥) بیبر بکەرەوە کەعیسای کوڕی مەریەم ووتی : ئەی کوڕانی یعقوب بێگومان من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە ، بەبڕواکەر بەو تەوراتەی کە لەبەردەستمایە .

---

مەبەس ئەوەیە کە هەموو یەك دڵو یەكگیان بن ، وە بە سەروماڵ ، یارمەتی یەك بدەن ، وە ڕێنەدەن کە دوژمن ڕێیان پێبەرێ .

* * *

ئنجا خوا بیبری مسلمانانی ئەخاتەوە کە بێفەرمانیی پێغەمبەران زۆر خراپە ، وە باسی مووساو بێفەرمانیی گەلەکەی ئەکات ، تا مسلمانەکانیش وەك جوولەکەکان بێفەرمانیی پێغەمبەرەکەیان نەکەن ، ئەفەرموێ ( واذ قال موسی لقومه ) بیبربکەرەوە کە مووسا بە گەلەکەی خۆی ووت ( یا قوم ) ئەی گەلی خۆم (لم تؤ ذوننی) بۆچی ئازارم ئەدەن (وقد تعلمون) لە کاتێکا کە بەڕاستی ئەزانن (انی رسول الله الیکم) کەمن ڕەوانە کراوی خوام بۆ لای ئێوە ، بەو معجزانەی کە خوا نیشانی داوون (فلما زاغوا) کاتێك کە لایاندا لە ڕێی ڕاست (ازاغ الله قلوبهم) خواش دلی ئەوانی لادا لە وەرگرتنی قسەی ڕاست (والله لا یهدی القوم الفاسقین) وە خوا ڕێنموونیی گەلی بەدکار ناکات .

(واذ قال عیسی ابنمریم) بیبر بکەرەوە کاتێككە عیسای کوڕی مریم ووتی (یابنی اسرائیل) ئەی کوڕانی یعقوب پێغەمبەر (انی رسول الله الیکم) بەڕاستی من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە بە دوو شت :

١ ـ (مصدقا) بە بڕواکەر (لما بین یدی من التوراة) بەو نامەیەی کە لەبەر دەستمایە لە تەورات ، واتە کە لەپێش منا هاتووە ، وە من بڕوام پێهێناوە .

وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ، فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا: هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ (٦)

---

وە بە مژدەدەر بە ڕەوانەکراوێك کە لە دوای من دێ کە ناوی ئەحمدە ،
ئنجا کاتێك کە ئەو (پێغەمبەرە) یانبۆ هات بەچەند نیشانەیەکی ڕۆشنەوە ووتیان:
ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە (٦) .

---

٢ ـ (ومبشرا) وە بە مژدە دەر (برسول یاتی) بەپێغەمبەر ێکی ڕەوانەکراو ، کە دێ (من بعدی) لەدوای من (اسمه احمد) کە ناوی ئەحمدە .

ئاشکرایە کە لە کاتی پێغەمبەرا قورئان خوێندراوە تەوە بە سەر هەزاران گاوورو جوولەکەدا، وەهەموو گوێیان لێبووە، کە قورئان ئەفەرموێ «النبی الامی الذی یجدونە مکتوبا عندهم فی التوراة والانجیل» واتە ئەو پێغەمبەرە نەخۆێندەوارەی کە ناوی نوسراوە لە تەورات و ئینجلا .

ئەو زانایانی گاوورو جوولەکەیەی کەمسلمان بوون ـ وەك عبداللەی کوڕی سلام ـ دانیان ناوە بە مەدا ، لە گەڵ ئەمیشە کە ئینجیلی بۆ حەنا ، لەفەسلی پانزەدا ئەفەرموێ «ان الفار قلیط روح الحق الذی یرسله ابی ، یعلمکم کل شیء» واتە فار قلیط گیانی ڕاستی یە کە خوا ئەی نێرێ ، وە هەموو شتێکتان فێر ئەکات .

فار قلیط مەعنای «حمد» ئەگەیەنێ ، واتە سوپاس ، لەبەر ئەوە هێندێك وەرگێڕاوە بە «حماد» واتە زۆر سوپاسگوزار ، وە هێندێك بە «حامد» واتە سوپاسگوزار ، کەواتە لە مەعناکەیا اشارە هەیە بۆ ناوی پێغەمبەر کە احمدو محمدە .

* * *

وا دەرئەکەوێ ئەم ئایەتانەی دوایی هاتوون دەربارەی بەپیرەوەچوونی جوولەکەو گاوورەکان بۆ ئەو پێغەمبەرەی کە نامەکانیان مژدەی پێ داوە ، وەسەر کۆنەیان ئەکات لەسەربە پیرەوە چوونە کەیانو فڕوفێڵیان لەگەڵئەم دینە تازەیەدا، کە خوا بڕیاری داوە کە سەر هەموو دینەکانی تری بخات ، وەببێ بە دواترینی هەموو دینەکان .

بەڵێ جوولە کە بەرانبەری ئەم دینە تازەیە وێستا ، وەك دوژمنێکی خوێنە خوێ ، بە هەموو فڕو فێڵ و درۆو دە لە سەو ساختە چێتی یەکەوە ، وەچوون بە گژیا بە هەموو ڕەنگێك ، تەنانەت بەم جۆرەش کە ئەفەرموێ ( فلما جاءهم ) ئنجا کاتێك کە ئەو ئەحمەدەی مژدەپێدراوەیان بۆ هات ( بالبینات ) بە چەند نیشانەیەکی ڕۆشنەوە ، کە گەورەترینیان قورئانە ( قالوا ) ووتیان ( هذا سحر مبین ) ئەم

قورئانەی کە هێناوتە جادوویەکی ئاشکرایە ٠

جوولەکە هەر لەسەرەتاوە چوون بە گژ ئیسلاماتا ئەمڕۆ ٠

چوون بە گـژیا ، لەیەکـەم ڕۆژەوە بە هەوڵدان بۆ تێکـدانی ناوەنـدی کۆچکەرانو یارمەتیدەران ، تا لەیەکیان بکەن ، هەروەك هەوڵیاندا بۆ ئەوەی کە تیرەی « ئەوس » و « خەزرەج » بکەنەوە بە گژ یەکا ٠

چوون بە گژیا بە ڕێکەوتن ، دەمێ لەگەڵ ناپاکانو دەمێ لەگەڵ هاوبەش پەیداکەرەکانا ٠

چوون بە گژیا ، بە دانەپاڵ هێرشبەران بۆ سەر مدینە لەجەنگی خەندەقا ٠

چوون بە گژیا بـە بلاوکردنەوەی بوختانە گەورەکـە «افك» لە سەردەمی سەرۆکی ناپاکان عبداللە کوڕی ابی سەلوول ٠

چوون بە گژیا ، لەئاژاوەی عوسمانا ، لەسەردەمی عبداللەی کوڕی سبأ ٠

چوون بە گژیا ، بە هەڵبەستنی قسەی درۆودەلەسەو شتی پڕوپووچ بـەدەم پێغەمبەرەوە ، بەجۆرێکی وا کە گەلێ لەتەفسیرەکانی پێشووی قورئان زۆر لەو جۆرە شتانەیان تێخراوە ٠

هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان ، ئەم ئاگری جەنگە نەکووژاوەتەوە ، وە بڵێسەی کز نەبووە ، بەڵکو جوولەکەو گاوور هەمیشە لەفڕوفێڵو تەڵەکەو ، داونانەوەدا بوون بۆ ئیسلام ، تا ئەمڕۆ ، دەمێ بەناوی جەنگی سەلیبی‌یەوە ، لەڕۆژهەڵاتو ، دەمێ لەڕۆژئاواو ئەندەلسو ، دەمی لەڕۆژهەلاتی ، ناوەڕاستو دەوڵەتی عوسمانێدا ، تا ئەم دەوڵەتە گەورەیەیان پارچە پارچە کرد ، وە کەلەپوورەکەیان دابەش کـرد لەناو خۆیانا ، ئنجا فسفس پاڵەوانێکیان دروست کردو فوویان پیاکـرد ــ وەك سید قطب ئەفەرموێ ــ وە لەشکری سوێندخواران « حلفاء» گۆیا لەترسی ئـەو ، گەڕانەوە لـە ئەستەنبووڵ ، وە بەو فسفس پاڵەوانـە جێنشینیی «خلافە»و پیتی عەرەبی‌و زمانی عەرەبی‌یان هەڵگرت ، وە دەوڵەتی ترکیان کرد بە دەوڵەتێکی کلا ، لە دین ، وە لەهەرلایەك جووڵانەوەیەکی ئایینی ببێ خێرا فسفس پاڵەوانێکی بـۆ دروستئەکەن ، وە ڕێی چەند ئیشێکی ئەدەن تا تۆزێ بەرزی‌بکەنەوە ، لەبەر چاوی گەلەکەی ، ئنجا هەرچی توروسکەیەك ببێ ، پێی نەکووژێننەوە ، وە هەر کۆسپێك ببێ لەڕێیانا پێی تەخت ئەکەن ، وە هەر هیوایەك ببێ ، پێی بە بـا ئەدەن ٠

ئەوەبوو لەئایەتی پێشوودا فەرمووی : خاوەن نامەو هاوبەش پەیداکەرەکان ، کە ئایەتی قورئانیان بۆ ئەخوێنرایەوەو بانگئەکران بۆ مسڵمان بوونو بـڕوا

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللهِ الْكَذِبَ . وَهُوَ يُدْعَى إِلَى الْإِسْلَامِ ؟ وَاللهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٧) يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللهِ بِأَفْوَاهِهِمْ ، وَاللهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ (٨)

**کێ لەو کەسە ستەمکار ترە کە درۆ هەڵبەستێ بە دەم خواوە ، لەکاتێکـا کە بانگ بکرێ بۆ مسڵمان بوون ؟ وە خوا رێ نموونیی گەلی ستەمکار ناکات(٧) ئەیانەوێ رووناکیی (دینی) خوا بکووژێننەوە ، بەدەمیان ، وە خوا رووناکیی خۆی تەواو ئەکات ، با بێ‌بڕوایانیش پێیان ناخۆش‌بێ(٨)**

**هێنان بەخوای گەورەو بە دەسەڵات ، ستەمیان لەخۆیان ئەکرد ، کە ئەیانووت : ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە ، وە لەمانە ستەمکارتر نیە ، وەکو ئەفەرموێ ( ومن اظلم ممن افتـری علی‌الله الکذب) کێ لەو کەسە ستەمکارترە کـە درۆ هەڵبەستێ لەسەر خوا ، بەم رەنگە هاوبەشی بۆ پەیدا بکات ، وە بە پێغەمبەرەکەی بڵێ درۆ ئەکات ، وە ئەوەی کە بۆمان ئەهێنێ جادووە ، ئەمەش کە ئەڵێ ( وهو یدعی الی الاسـلام ) لەکاتێکا ئەیڵێ کە بانگ‌ئەکرێ بۆ بڕواهێنان بەخواو مسـڵمان‌بـوون (والله لایهدی القوم الظالمین) وە خوا رێ نموونیی گەلی ستەمکارر ناکات ٠**

**ئەم ستەمکارانە ئەیانەوێ بە قسە ، ئەم دینە تازەیە برووخێنن ، وە بە فوو چرایەک بکوژێننەوە کە خوا هەڵی گیرساندووە ، ئنجا لە رووی گاتە پێ کردنەوە پێیان ئەڵێ (یریدون) ئەم بێ بڕوایانە ئەیانەوێ (لیطفئوا نور الله) کە رووناکیی دینی خواو رۆشنایی ئایینی ئیسلام بکووژێننەوە ( بافواههم ) بە دەمو پلیان ، وە بە درۆو دەلەسە بلێسەیەک دابمرێننەوە کە خوا هەڵی‌گیرساندووە (والله متم نوره) وە خوا رووناکیی خۆی تەواو ئەکات تابەهەمووجیهانی ڕائەگەیەنێ (ولوکره الکافرون) بابێ‌بڕوایانیش پێیان ناخۆش‌بێ، واتە پێ‌ناخۆشی ئەوان هیچ‌کارناکاتە سەر ئەو رووناکی‌یە ، هەروەک پێ‌ناخۆشی شەمشەمەکوێرە هیچ جۆرە پەردەیەک ناهێنێ بەسەر وورشەو پرشەی رۆژا ٠**

**بەڕاستی خوا بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر ، وەپێغەمبەری ئیسلامی نـارد ، وە لە ماوەی ٢٣ سالا هەموو قورئانی بۆ نارده خوارەوە ، وە دینی ئیسلامی بەپایان گەیاند ، لەپاشا کۆمەڵێکی گـەورەی لەمسڵمانان پێک هێنـا لەئاسیاو ئـەفریقاو ئەوروپادا ، وە ئەمانەی کرد بە گیان‌فدای ئیسلامو مسڵمانان ، بەجۆرێک کە سەرو**

هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ . وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ (٩) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ؟ (١٠)

**خوا ئەو خوایەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە ڕێنموونییو ئایینێکی ڕاستو دروستەوە ، تا سەر هەموو ئایینێکی بخات ، بـا هاوبەش پەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێ(٩) ئەی ئەوانەی کـە بڕواتان هێناوە ، ئایا ڕێنموونییتان بـکەم بۆ بازرگانێتییەك کە ڕزگارتان بکا لە سزایەکی پڕ لە دەرد ؟(١٠)**

**ماڵی خۆیان بەخت کرد لەڕێی سەرکەوتن و پێشکەوتنی ئیسلام و مسڵمانانا ، وە بەڕانبەری هێرش و سێڵاوی دوژمنان ویستان .**

**چۆن تیشکی ڕۆژبە فوو ئەکووژێتەوە ؟ وەقورسی ڕۆژ، بەپەڕۆ ، دائەپۆشرێ؟ دینێك کە خواخۆی بناغەی بنێ‌و، ڕێنموونییەك کەئەو بیکات چۆن کوێر ئەبێتەوە؟ وەکو ئەفەرموێ (هوالذی) خوائەوخوایەیە(ارسل رسوله) کەپێغەمبەری خۆی‌ناردووە (بالهدی) بەڕێنموونیی (ودین الحق) وە بەئایینێکی ڕاستودروستەوە (لیظهره علی الدین کله) تا زاڵی بـکات بەسەر هەموو ئایینێکا (ولوکره المشرکون) بـا هەرچی هاوبەش پەیداکەرانیش هەیە ، پێیان ناخۆش بێ .**

**بەڵێ خوا ئەم بەڵێنەی هێنایەدیی ، وەئەم دینەی بەرزکردەوە بەسەر هەموو دینەکانا ، وە لە ڕۆژی هەڵاتنیەوە ، ڕۆژبەڕۆژ سەرزەویی ڕووناك‌کردەوە تا بەشی زۆری سەرزەویی کرد بە ڕۆژی ڕووناك .**

* * *

**دوای ئەوەی کەفەرمووی خوا ئەوانەی خۆش‌ئەوێ کەجەنگ‌ئەکەن لەڕێی‌خوادا بەکۆمەڵیی ، وەدوای ئەوەی کەجڵەوگیریی مسڵمانانی کرد لەوەی کەوەك گەلی مووسا پارەپەرستبن‌و وەك‌گەلی عیسا فەرمان نەبەرین، وەدوای‌ئەوەی کەبەڵێنیدا بەجێ‌گیر کـردنی ئەم دینە ، ئنجا بانگی مسڵمـانانی ئەوڕۆژە ئەکات بەخۆیان و هەرچی بەدوایانابێ‌تاڕۆژی دوایی -بۆباشترین بازرگانێتی ئەفەرموێ (یاایهاالذین امنوا) ئەی ئەوکەسانەی کە بڕواتان هێناوە (هل‌ادلـکم) ئایا ڕێنموونیتـان بکەم (علی تجارة) بـۆ بازرگانێتی‌و کڕین‌و فرۆشـتنێك (تنجیکم) کە ڕزگارتـان بکا ( من عـذاب الیـم ) لـە سـزایەکی پـڕ دەرد و سـوێ ، ئنجا خـوا خـۆی**

تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ . وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ . إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (١١) يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ . وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ . وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ . ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٢)

---

( کە ئەوەش ئەمەیە ) بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەری خوا ، وە جەنگ بکەن لە ڕێی خوادا بە سەر و ماڵی خۆتان ، ئەمەتان باشترە بۆخۆتان ، ئەگەر بزانن (١١) (ئەگەر وابکەن‌خوا) لەگوناهەکانتان خۆش ئەبێ ، وە ئەتان‌باتە ناوباخاتێکەوە کەجۆگە ئاوی زۆر بەبنکیانا ئەڕوا،وە(داتان‌ئەنێ)لەچەند کۆشکێکی پاکیزە لەبەهەشتانی هەتا هەتاییدا ، ئەمەیە ڕزگاریی گەورە(١٢)

---

وەرام ئەداتەوە ئەفەرموێ : ئەو بازرگانێتییە ، ئەمەیە کە (تؤمنون) بڕوابێنن (بالله ورسوله) بەخواو پێغەمبەری‌خوا (وتجاهدون) وە تێکۆشن ( في سبيل الله) لە ڕێی خوادا (باموالكم وانفسكم) بە سەرو ماڵی خۆتان ، بۆ بڵاوکردنەوەی دینو بەرزکردنەوەی ئایین ٠

جەنگ لەڕێی خوادا گەلێ جۆری هەیە : یەکێکیان جەنگە لەگەڵ دوژمنانا بە چەك ، یەکێکیان جەنگە لەگەڵ نەفسا بە لغاوگرتنی لەو شتە خراپانەی کە ئارەزووی ئەکات٠یەکێکیان جەنگە لەناوەندی نەفسو مەردومانا، بەڕێرپێ‌خستنی هەموو جۆرە تەمەعێكو دەستگیرانەوە لەسەروماڵو ناموسیان ، وە هەوڵدان بەپێی تەوانا بۆ خزمەتکردنیان ٠

( ذلكم خير لكم ) ئەم کارەتان لەهەموو بازرگانی‌یەك باشترە بۆ خۆتان ( ان كنتم تعلمون ) ئەگەر تێ‌بگەن ٠

ئنجا باسی ئەم شتە باشە ئەکات ، ئەفەرموێ ئەگەر وابکەن ( يغفر لكم ذنوبكم ) خوا لەگوناهەکانتان خۆش‌ئەبێ ( ويدخلكم جنات ) وە لەڕۆژی دواییدا ئەتانخاتە ناو باخاتێکەوە ( تجري من تحتها الانهار ) کە جۆگە ئاوی زۆر بە بنکیانا ئەڕوا ( ومساكن طيبة ) وە داتان ئەنێ لەجێگاو ڕێگاو کۆشکی پاكو تەمیز ( في جنات عدن ) لەبەهەشتانی هەتاهەتاییدا ( ذلك الفوز العظيم ) ئەمەیە ڕزگاریی گەورە ٠

ئەمانەی کە ووتران پاداشتێکی ڕۆژی دوایین ، جا لەبەرئەوەی کە ئادەمیی لەئاوو گڵی زەویی دروست بووە ، وە هەمیشە چاوی لەپاداشی جیهانیشەوەیە ،

وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا: نَصْرٌ مِنَ اللهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ. وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ(١٣)
يَـٰأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا. كُونُوا أَنْصَارَ اللهِ. كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ
مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ:

**وە شتێکی تر کە حەزی‌لێ‌ئەکەن (کە ئەویش) یارییدەدانە لە خـواوەو گـرتنی شاری مەککەیە بەم زووانە ، وە (بەمە) مژدە بدە بەوانەی کە بڕوایان هێناوە(١٣) ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ، ببن بە یارمەتی‌دەرانی خوا ، هەروەك عیسای کوڕی مریم بە هاوڕێ تایبەتی‌یەکانی خۆی ووت :**

**بۆیە دوای باسی پـاداشی ڕۆژی دوایی ، ئنجا باسی پاداشی جیهـان ئەکـات ، ئەفەرموێ ( واخری تحبونها ) وە بە بەهرەیەکی ترتان ئەگەیەنێ لەجیهانا کـە حەزتان لێیەتی‌و ئارەزووی ئەکەن ، کە ئەویش ( نصر من‌الله ) یارییدەدانتانە لە خواوە ( وفتح قریب ) و گوشادی‌یەکی نزیکتو کردنەوەی گرێیەکە ، وەك گرتنی شاری مکە بێ ( وبشر المؤمنین ) وە مژدە بدە ـ ئـەی پێغەمبەر ـ بـە مسڵمانان ، کە بەم زووانە ئەم بەڵێنە دێتەجێ ٠**

**بەڵێ خوا بەڵێنی خۆی بەجێ‌هێنا بە زیادەوە ، لە ساڵی هەشتەمی کۆچی‌دا مەککە گیرا ، لەساڵی یانزەدا پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد ، دوای ئەو ، سـەد ساڵی‌نەخایاند کە بەیداخی ئیسلامەتی لەبەشی‌زۆری جیهانی ئەو ڕۆژەدا هەڵکرا ،وە بە چرای ئیسلامەتی هەموو سەرزەویی ڕووناك بووەوە ٠**

**ئەم باسی جەنگ لەڕێی خودایەی ، کە لەسەرەتاو داوێنی سوورەتەکـەوە کرد ، بەم جۆرە گـەرم‌وگوڕی‌یە ، کـە پاڵ‌ئەنێ بە هەموو مسڵمانێکەوە ، بـۆ سەردانان‌و گیان‌بەخت‌کردن ، وە ئـەم چـرایەی کە دایگیرساند لـەدڵ‌ودەروونی بڕواداراندا ، ئەگونجێ هێندێ جار لەبەر هێندێ شت کز ببێ ، وە ئەم پاڵ‌پێوەنانە سست‌ببێتەوە ، ئنجا بۆ گەرم‌کردنەوەی دڵی ئەو کەسانە ، دوایی سـوورەتەکەی هێنـا بە بـانگ کردنێـکی تـر ، وە لـە بـەرگ و کاڵایـەکی ترا ، فەرمـووی ( یاایهاالذین امنـوا ) ئەی ئەو کەسـانەی کە بڕواتان هێنـاوە ( کونوا انصارالله ) ببن بە یارمەتی‌دەرانی خوا ، وە خزمەتی دینەکـەی بکەن‌و بەرزی‌بکەنەوە ، وەك هاوڕێ تایبەتی‌یەکانی عیسا کردیان ، لەکاتێکا کە داوای یارمەتی لێ‌کردن ، وەکو ئەفـەرموێ ( کما قـال عیسی ابن مریم ) هـەر وەك عیسای کوڕی مەریەم ووتی ( للحوارین ) بەهاوڕێ تایبەتی‌یەکانی خۆی کە دوانزە**

مَنْ أَنْصَارِي إِلَى اللهِ؟ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ: نَحْنُ أَنْصَارُ اللهِ. فَآمَنَتْ طَائِفَةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ. وَكَفَرَتْ طَائِفَةٌ. فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَى عَدُوِّهِمْ. فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ (١٤)

**کێ یارمەتیدەری منە بۆ لای خوا ؟ هاوڕێکانی ووتیان : ئێمە یارمەتیدەرانی ( دینی ) خواین ، ئنجا دەستەیەك لەکوڕانی یعقوب بڕوایان هێناو دەستەیەك بێبڕوابوون ، ئێمەش پشتیوانی ئەوانەمان کرد کە بڕوایان هێنا ، بە سەر دوژمنەکانیانا ، تا گەوران بەزاڵ(١٤)**

کەس بوون : ( من انصاری الی‌الله ) کێن ئەوانەی کە یارمەتیم ئەدەن بۆ بانطك کردنی مەردوم بۆ ڕێی خوا ؟ ( قال الحواریون ) هاوڕێ تایبەتی‌یەکانی ووتیان ( نحن انصارالله ) ئێمەین یارمەتیدەرانی دینی خوا ٠

بە ڕاستی ئەمانە لێبڕان بۆ خوا ، وە تا مان دینی عیسایان بە پاكوتەمیزیی بلاوکردەوە ، بەڵێ عیسا بۆ ئەوە هات کە مژدە بدا بە پێغەمبەری ئیسلام‌و دینی ئیسلام ، چەند شایستەیە بۆ ئومەتی محمد ، نەخوازەلا خوێندەوارانی ئایینی ، کە ئەمانیش لێبڕن بۆ ئەم پێویستە گەورەیە ٠

ئنجا ئاخۆ چی‌بووبێ ، ئەنجامی ئەم‌لێبڕانی هاوڕێیانی عیسایە ؟ وا بۆمان باس ئەکات ئەفەرموێ ( فامنت ) بڕوایان هێنا بە پێغەمبەرێتی عیسا ، بەهۆی هەوڵ‌و تەقەلای ئەم هاوڕێیانەوە ( طائفة من بنی اسرائیل ) دەستەیەك لەکوڕانی یعقوب ، وە عیسایان بە پێغەمبەری خوا نەناسیی ( وکفرت طائفة ) وە دەستەیەکی تر لە نەوەکانی یعقوب بێبڕوابوون ٠

ئنجا هەر بڕوایان پێ‌نەبوو ، وە قسەی ناشرینیان ئەکرد دەربارەی خۆی‌و مەریەمی دایکی ، وەیا لەژوور پلەی پێغەمبەرێتی‌یەوە تەماشایان ئەکرد ، بەم‌ڕەنگە هەندێکیان ئەیانووت : کوڕی خوایە ، هێندێکیان ئەیانووت : سیهەمی سیانە : باوك وکوڕو گیانی‌پاك ، هێندێکیان ئەیانووت : خوایە ٠

(فایدنا الذین امنوا) ئێمەش پشتیوانیی ئەوانمان کرد کەبڕوایان هێنا بەپێغەمبەریەتیی عیسا (علی عدوهم) بەسەر دوژمنەکانیا، کەبەلایانەوە وایە عیسا خوایە ، یا کوڕی خوایە ، یا سیهەمی سیانە (فاصبحو ظاهرین) وە بڕوا دارەکان گەوران بە زاڵ بەسەر بێبڕواکانا ، واتە بەڵگەی ئەوانەی کە ئەڵێن پێغەمبەرە ، گەلێ گەلێ ڕاستترە ، لە بەڵگەی ئەوانەی کە ئەڵێن سیهەمی سیانە ٠

## سوورەی «جمعە»یە

مدنی‌یە ، ١١ ئایەتە ، ١٧٥ ووتەیە ، ٧٢٠ پیتە

بسم‌الله الرحمن الرحيم

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە دوای سوورەتی «صف» هاتۆتە خوارەوە ، وە هەردوکیان چارەی یەکشت ئەکەن ، بەڵام هەریەکە لەڕوویەکەوە ، بەم ڕەنگە ئەویان هەوڵ‌ئەدات بۆ چەسپاندنی ئەوەی کە ئایینی ئیسلام دواترین ئایین وە پوختەترین دینە ، وە ئەمیان هەوڵ ئەدات بۆ چەسپاندنی ئەوەی کە مسڵمانەکانی مەدینە ــ بە کۆچکەرانو یارمەتی‌دەرانەوە ــ هەڵبژێرراوون بۆ هەڵگرتنی ئەم سپاردەیە تا نەیدەنە دەست چینێکی‌تر لە دوای خۆیان لە مسڵمانان ، وە چین بە چین ئاگاداریی ئەکەن تا ڕۆژی خۆی ، ئەمەش دوای ئەوەبوو کە نەوەکانی یعقوب سپاردەی خوایان پشت گوێ‌خست ، وەپەیوەندی‌یان لەگەڵ‌ئاسمانا ، نەما ، وەدەست بەرداری تەورات بوون ، وەکاریان پێ نەکردو بەهرەیان لێ‌وەرنەگرت ، وەك کەرێك کە بارێك کتێبی بەسەر پشتەوەبێ چەندە بەهرەی لێ‌وەرئەگرێ ، ئەوانیش هەر ئەوەندە بەهرەیان لە تەورات وەرگرت .

ئنجا لەوکاتەدا ئەم سوورەتە چارەی هێندێشتی تریش ئەکات کەلەکاتی پێغەمبەر ڕوویداوە لەمەدینەدا ، کە ئەویش ئەوەبوو ، لەڕۆژی هەینی ، وە لە کاتی جمعەدا پێغەمبەر لەسەر دووانگە « منبر » کە دوواوە لەژووری مزگەوتا ــ کاروانێکی خواردەمەنی لەو حەلەدا ئەگاتە ناوشاری مەدینە، بەگۆڕانیی و دەف لێدانەوە ، وەئەو نوێژکەرانەی کەلەژووری مزگەوت ، گوێ‌یان لەپێغەمبەر گرتبوو ، زۆریان هەڵ ئەستن و ئەچنە دەرەوە بۆشت کڕین و سەیر کردن ،وەپێغەمبەر بەجێ‌دێڵن ، لەکاتێکا کەبەپێوە وێستاوەو خوتبەی خوێندۆتەوە.

سورة الجمعة

بسم الله الرحمن الرحيم

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ(١) هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ ، يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ ، وَيُزَكِّيهِمْ ، وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ ، وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ(٢)

**سوورەی «جمعه»یە**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**بەپاکیی‌یادی خوا ئەکات ئەوی لە ئاسمانەکان و زەویی‌دایە ، (ئەو خوایەی) کەپاشایەکی پاکی زاڵی کاردروستە (١)خوا ئەو خوایەیە کەڕەوانەی کردووە لەناو نەخوێندەوارانا پێغەمبـەرێك لە خۆیان ئەخوێنێتەوە بەسەریانا ئایـەتانی خوا ، وەپاکیان ئەکاتەوە ، وەنامە (ی قورئان) و فەرموودەی (پڕسوود) یان فێرئەکات ، هەرچەند ئەوان لەمەپێش لەگومراییی‌یەکی ئاشکرادا بوون(٢) ٠**

**ئنجا بابزانیین ئەم سوورەتە ، چی ئەڵێ ؟ ئەفەرمۆێ (یسبح‌لله) بەپاکیی یادی خوا ئەکات (مافي السماوات) ئەوی لەئاسمانەکانە (ومافي الارض) وە ئـەوی لەزەوی دایە ، ئەوخوایەی (الملك) کەپاشایەکی (القدوس) پاکی (العزیز) زاڵی (الحکیم) کار دورستـــە ٠**

* * *

**ئنجا دێتــە سەر سەر باس «مــوضوع» ی گرنگی سوورەتەکە ، ئــەفەرموێ (هو الذی) خوا ئەو خوایەیە (بعث في الامیین) کە ڕەوانەی کردووە لەناو گەلێکی نەخوێندەوارا ، کەگەلی عەرەبە (رسولامنهم) پێغەمبەرێك لەخۆیان (یتلوعلیهم) ئەخوێنێتەوە بەسەریانا (ایاتە) ئایەتانی نامەی خواکە قورئانە (ویزکیهم) وەپاکیان ئەکاتەوە لەپیسی بێبڕوایی و بێڕەووشت و خــویی (ویعلمهم‌الکتاب والحکمة) وە قورئانو فەرموودەی پڕ سوودی خۆیان فێرئەکات (وان کانوا من قبل) هەرچەند ئەوان لەمەپێش ،واتەلەپێش ناردنی پێغەمبەرا (لفی‌ضلال مبین) لەگومرایی‌یەکی ئاشکرادا بوون ، وەکجەعفەری کوڕی‌ئەبوتالب بەنەجاشیی پاشای حەبەشەی‌ووت:**

وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٣)

وە (ڕەوانەشی کـردووە) لەناو گـەلانی تری جیـاواز لەوان کە هێشـتا پێیان نەگەیشتوون وە خوا زاڵی کاردروستە(٣)

«ئەی پاشا ، ئێمە جـاران گەلێکی دواکەوتووی ، نەخوێندەوار بوویـن • بتمان ئەپەرستو ، مردارەوەبوومان ئەخواردو ، داوێنپیسی‌مان ئەکرد ، خزمایەتیی‌و دۆستایەتییمان نەئەزانی چی‌یە ، زۆردارمان زەبوونی قووت ئەدا ، ئابەم ڕەنگە بووین تاخوا پێغەمبەرێکی ڕاست گۆی ، دەستپاکی ، بۆناردیین لەخۆمان ، وە لە خێزانێکی ناوداری ناسراو ، بانگی کردیین بۆ ناسینی خوایەکی تاکتوتەنیا ، وە ژێرپێ‌خستنی ئەو بتانەی کەجاران ئەمانپەرستن، وە فەرمانی پێ‌داین، بەڕاستیی‌و ، دەست پاکیی و ، دانەوەی سپاردەو ، خـزم پەیوەستیی‌و ، دراوسێ شناسیی‌و ، دەستگێڕانەوە لە سەروماڵ و ناموسی مەردوم و ، لەهەمووکارێکی ناشرینی‌و ، قسەیەکی درۆو ، خواردنی ماڵی هەتیوو ، بوختانکردن بە ژنانی پاکداوێن • وە فەرمانی پێ‌داین بە خواپەرستیی ، کە هەرگیز هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەین ، وە بە نوێژو زەکاتو ڕۆژوو » •

پێغەمبەرێتی پێغەمبەر هەر بۆ ئەوان نەبووە کە لەکاتی خۆیا دەنگی پێغەمبەریان پێ‌گەیشتووە ، بەڵکو بۆ ئەوانەشە کە لە دوای ئەوان دێن تا ڕۆژی دوایی لەهەموو گەل‌و تیرەو هۆزێك، وە لەهەموو چینێك کەبەرەودوا دێن تاجیهان تەبرێتەوە وەکو ئەفەرموێ (واخرین) واتە هەروەك ڕەوانەی کردووە لەناو گەلێکی نەخوێندەواری وەك عەرەبا ، ڕەوانـەشی کردووە لەناو گەلی‌تـری جیاواز (منهم) لـە عەرەب ، وەك گەلانی تر بێ ( لما یلحقوا بهم ) کە هێشتا نەهاتوون‌و نەگەیشـتوون بـە هاوڕێ‌یانی پێغەمبەر ، واتە هەروەك لەعەرەب مسڵمان ئەبن ، لەگەلانی تریش مسڵمان ئەبن ، وە هەرچی دوای کۆچی پێغەمبەر مسـڵمان ببێ ، لەهەر گـەل‌و نەتەوەیەك بێ ، بەر ئەم ووتەی « آخرین »ە ئەکەوێ •

( وهو العزیز ) وە خوا زاڵ‌و بە دەسەڵاتە ، ئەتوانێ ئەم دینە بکات بـە دینێـکی عالـەمیی (الحکیم) کار دروسـتە ، ئەزانێ کێ هەڵئـەبژێرێ بـۆ ئەم پێغەمبەریەتی‌یە گەورەیە • هەڵبژاردنی محمدی کوڕی عبدالله بۆ پێغەمبەریەتی هەموو ئادەمیی تا ڕۆژی دوایی میهرەبانی‌یەکی زۆر گەورەی بێ‌پایانە لەخـواوە

ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ (٤)
مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ
يَحْمِلُ أَسْفَارًا ۚ بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ !

**ئەوە زیادە میهرەبانییەکی خواییە ، ئەیدا بە هەر کەسێك کە ( خۆی ) ئارەزوو بکات ، وە خوا خاوەنی بەخششی گەورەیە(٤) نموونەی داستانی ئەوانەی کە تەوراتیان دراوە بەسەرا و لەپاشا هەڵیاننەگرت ، وەك کەرێك وان کە کتێبێکی زۆری هەڵگرتبێ ، بە دە نموونەی داستانی گەلێك کە ئایەتانی خوا بە درۆ ئەزانن !**

**دەرحەق بە پێغەمبەر ، وەکو ئەفەرموێ ( ذلك ) ئەم ڕەوانەکردنی پێغەمبەرە بۆ سەر هەموو ئادەمیی تا ڕۆژی دوایی ( فضل الله ) زیادە میهرەبانییەکی خواییە ( یؤتیه ) ئەیدا ( من یشاء ) بە هەرکەسێك کە خۆی ئارەزوو بکات لەبەندەکانی ( والله ذوالفضل العظیم ) وە خوا خاوەنی بەخششی زۆر گەورەیە ئەیدا بە هەرکەسێك کە خۆی بە شایستەی بزانێ وەك حەزرەتی محمد بێ ، ئەمە پلارێکە ئەیگرێتە ئەو جوولەکانەی کە لایان وایە پێغەمبەریەتی بۆ غەیری جوولەکە نەبووەونابێ ، لەبەرئەوە بڕوایان بە پێغەمبەر نەهێنا ، ئنجا خوا بیروباوەڕەکەیان بە درۆ ئەخاتەوە ، بەم ڕەنگە ئەمانە ئەگەر باش لەتەوراتەکەی خۆیان بگەیشتنایە ، وە ڕەفتاریان پێبکردایە ، باسی پێغەمبەری ئیسلامیان تیا ئەخوێندەوە ، کە خوا لەوێ مژدەی داوە بە ناردنو ڕەوانەکردنی لەدوای هەموو پێغەمبەران ، وە پێویستی کردووە لەسەریان بڕواپێهێنانیو دواکەوتنی ، وە نموونەی ئەم جوولەکانە لە هەڵگرتنی تەوراتو ، چوونە ژێرییو ، ڕەفتار پێنەکردنی ، وەك کەرێك وان کە بارێ کتێب بە سەرپشتییەوە بێ ، وە هەمیشە نقەی بێ لە ژێریا ، وە هیچ کەڵکێکی لێوەرنەگرێ ، ئەفەرموێ :**

**( مثل الذین حملوا التوراة )وێنەی ئەو جوولەکانەی کە فەرموودەی تەوراتیان دراوە بەسەرا کە هەڵیگرنو بڕوای پێبێننو ڕەفتاری پێبکەن ( ثم لم یحملوها ) لەپاشا هەڵیاننەگرت ، واتە بڕوایان پێنەهێناو بە گوێیان نەکرد ( کمثل الحمار یحمل اسفارا ) وەك کەرێك وانە کە بارێ کتێب هەڵگرێ ، واتە هەمیشە نقەی دێ لەژێریا ، بێئەوەی بەهرەیەکی لێوەرگرێ (بئس مثل القوم الذین کذبوا بایات الله) زۆر بەدە نموونەی گەلێکیوا کە ئایەتانی خوا بە درۆ بزانن ٠**

**ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە بۆچی جوولەکە ڕێنموونییان نەکرد بە تەورات،**

وَاللهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ(٥) قُلْ: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا، إِنْ زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ للهِ مِنْ دُونِ النَّاسِ. فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٦)

---

وە خـوا ڕێنمـوونیی گـەلێ سـتەمکاران نـاکـات(٥)

بڵێ : ئەی ئەوانەی کە لەسەر دینی جوولەکەن ، ئەگەر لاتان وایە کە ئێوە دۆستی خوان بەبێ محمدو یارانی ، داوای مردن بکەن ئەگەر ڕاست ئەکەن(٦)

---

ئەفەرموێ ( واللە لایهدی القوم الظاوین ) خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات واتە دەستووروباوی خوا لەڕەووشتو خووی ئادەمی‌دا لەسەرئەوەیە ، هەرکەسێك کە زۆر مایەوە لەسەر زۆروستەمو دەستدرێژیی ، ئیستعدادو ئامادەیی نامێنێ بۆ ڕێنموونی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا چونکە جوولەکەکـان لافلێئەدەنو ئـەڵێن : « نحن ابناءالله واحباؤه » واتە ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی ئەویین ، وە بە گەزاف ئەڵێن : « لن یدخل الجنة الا من کان هودا » واتە ناچێتە بەهەشت جوولەکە نەبێ ، خوا فەرمانی دا بە پێغەمبەر کـە قسەیان لەگەڵ بکـات بە ڕەنگێك کـە دەمکوتیان بکات ، تا درۆکەیان دەربکەوێ ئەفەرموێ ( قل ) بڵێ ئـەی محمـد ( یاایهاالذین هادوا ) ئەی ئەو کەسانەی کە لەسەر دینی جوولەکەن ( ان زعمتم ) ئەگەر لاتانوایە ( انکم اولیاءلله ) کە ئێوە دۆستی خوان ( من دون الناس ) بێ محمدو یارانی ، وە پێتان وایە کە خۆتان لەسەر ڕێی خوانو ، ئەوان گومـران هەردوولاتان کۆببنەوە ، وە نزای مردن بکەن لەو دەستەیەی کە گومڕایە ، وەکو ئەفەرموێ ( فتمنوا الموت ) داوای مردن بکەن ( ان کنتم صادقین ) ئەگەر ڕاست ئەکەن کە ئەڵێن ئێمە خۆشەویستی خواین ، واتە ئەگەر خۆتان بە خۆشەویستی خوا ئەزانن داوای مردن بکەن ، واتە حەز لەمردن بکە ، تا زوو بکەونە خۆشیی بەهەشتو قیامەتـەوە ، کەچی ئەگەر بە ئارەزووی خۆتانبێ هەرگیـز ناتانەوێ بمرن ، کە ئەمە پێچەوانەی یەکن .

ئەمە پێی‌ئەڵێن : « مباهله » واتە وێستانی ئـەو دوو دەسـتەیەی کـە دەمقاڵێیانە ـ بەرانبەری یەك ، وە هەردولا نزای مردن بکەن لەدەستەی گومـڕا ، ئەمە ڕوویداوە لەگـەڵ جوولەکەدا ، وەك لێرەدا ، وە لەگـەڵ گاوورا ، وەك لە سوورەی «ال عمران»دا کە فەرمووی :

وَلاَ يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَداً بِمَاقَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ،وَاللهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ(٧) قُلْ : إِنَّ المَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنهُ فَإِنَّهُ مُلاَقِيكُمْ ، ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ .

**وە هەرگیز داوای ناکەن بەهۆی ئەو گوناهانەی کە بە دەستی خۆیان پێشیان خستووە ، وە خوا ئاگادارە بە ستەمکاران(٧) بڵێ: ئەو مردنەی کە لێی ڕائەکەن بێ‌گومان ئەتانگاتێ ، لەپاشا ئەبرێنەوە بۆلای خوای ئاگادار بە ئاشکراو نهێنی ،**

«فمن حاجك فيه من بعد ما جاءك من العلم فقل تعالوا ندع ابناءنا وابناءكم ونساءنا ونساءكم وانفسنا وانفسكم ثم نبتهل فنجعل لعنةالله على الكاذبين(١) .

هەرچی پێغەمبەر بانگی کردبێ بۆ ئەم مباهەلەیە ، ترساوەو نەی‌وێراوە ڕووبەڕووی پێغەمبەر بوێستێ کەئەمە نیشان ئەدا کەئەوانە هەموو بەدڵ زانیویانە کەپێغەمبەر ڕاست ئەکات ، وەدینەکەی ڕاستو خۆی پێغەمبەری بەڕاستی‌یە ، وەنزای گیرا ئەبێ و ناچێتە دواوە ، وەکو ئەفەرموێ (ولايتمنونەابدا) وەئەوان هەرگیز داوای مردن ناکەنو ئارەزووی ناکەن (بما قلمت ايديهم ) بە هۆی ئەو گوناهانەی کە کردوویانە ، وە بە دەستی خۆیان لەپێشەوە ناردویانە ، لەگۆڕینی تەورات و تێکدانی ناونیشانە کانی پێغەمبەر (والله عليم بانظالمين) وە خوائاگادارە بەستەمکاران .

دوای ئەم قسانە ئنجا باسی مردن و دوای مردن ئەکات ئ وەئەفەرموێ مردن شتێکی ناچاری‌یە کەس لەدەستی ڕزگار نابێ ، وەهەموو کەسێک بی‌یەوێ یانەوێ ئەبێ هەر بمرێ و بچێتەوە بەردەمی خوا، وەبەتۆڵەی خۆی بگات، ئەفەرموێ (قل) بڵێ ئەی‌محمد (ان الموت الذى) بەڕاستی ئەو مردنەی (تفرون منه) کە لێی‌ڕائەکەن (فانه ملاقيكم) بێ‌گومان پێتان ئەگات ، وەتووشتان ئەبێ (ثم تردون) لەپاشا ئەبرێنەوە (الى عالم الغيب والشهاده) بۆ لای خوای ئاگادار بە هەموو ئاشکراو

١ ـ واتە ئنجا هەرکەسێک دەمقاڵێی لەگەڵ کردییت لەبابەت عیساوە ، دوای ئەوزانیینەی کە بۆتهاتووە ـ بڵێ : بابانگی کوڕەکانمانو کوڕەکانتان و ژنەکانمانو ژنەکانتانو خۆمانو خۆتان بکەین ، لەپاشا بپاڕێینەوەو نەفرین بکەین لە درۆزنان .

فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٨) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٩)

---

**ئنجا ئاگادارتان ئەكات بەوەی کەکردووتانە (٨) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە کاتێك کەبانگدرا بۆنوێژ لەڕۆژی هـەینیدا ، بەپەلە بچن‌بۆیادی خـواو ، دەست هەڵـگرن لەکڕینو فـرۆتن ، ئەمەبۆخـۆتان بـاشترە ئەگەر تێ‌بگەن (٩)**

---

**نهێنی‌یەك (فینبئکم) ئنجا ئەو حەلە ئاگادارتان ئەکاتەوە (بما کنتم تعملون) بەوەی کەکردووتانە لەبێ بـڕوایـی‌و بەدکـردایی ٠**

* * *

**لەدوای ئەوەی کە سـەر کۆنەی جوولەکەی کرد لەسـەر خۆشەویستی دنیاو ڕەوکردنی لەمردن ، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە لەئاییینی ئیسلاما ، مەردوم‌ئەتوانێ هەووڵ بدات بۆدینییش و بۆ دنیاش ، بەم ڕەنگە لەڕۆژی هـەینی‌دا ئـامادەبێ بۆ چوونە جمعەو گوێ‌گرتن لە دوانی دواندەر ، دوای ئەوەش هەوڵ بدات بۆ کسبو کارودنیاداریی ، ئەفەرموێ (یاایها الذین امنوا) ئەی ئەوکـەسانەی کەبڕواتـان هێناوە (اذا نودی للصلاة) کاتێك کە بانگ‌درا بۆ نوێژی جمعە (من یوم الجمعة) لە ڕۆژی هەینی‌دا (فاسعوا الی ذکرالله) بە پەلە بچن بۆ یادی خوا ، کە گوێ‌گرتنە لە دوانو نوێژکردنە بە کۆمەڵی (وذو البیع) وە دەست‌هەڵگرن لەکڕینو فرۆشتن (ذلکم) ئەودەستـو بردو دەست هەڵگرتنەتان لەکڕینو فرۆتن (خیرلکم) بۆخۆتان باشترە لە خەریبك‌بوون بە خرییدو فرۆختەوە (ان کنتم تعلمون) ئەگەر تێ‌بگەن ، چونکە گوێ‌ئەگرن لەئامۆژگاریی‌و دووانی‌دواندەر، وەهێندێ زانیاریی‌تازە بەپێی ئەوڕۆژە وەرئەگرن ، جگە لەوە کەلەگەڵ خزمان و دراوسێ و ئاشناو ناسیاوانا ، کۆئەبنەوە لەنوێژی جمعەدا ، وەدۆستایەتیی و خزمایەتیتان تازە ئەبێتەوە ٠**

**نوێژی هەینی نوێژێکی حەفتەیی‌یە، بەکۆمەڵیی «جماعة» نەبێ دروست‌نی‌یە، پێویستە لەسەر هەمـوو پیاوێکی ، ساغی ، نیشـتەجێی ئازاد ، کـە بیانوویەکی شەرعیی نەبێ ٠**

**دووانەکەی وەك دەرسـێکی حەفتەیی وایە کە ئەدرێ بـە نوێـژکـەران ، وە ئەبێ لەوانەبێ هەموو کەسێك بەقەد خۆی بەهرەی لێ‌وەرگرێ ٠**

فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٠)

**کاتێك کە نوێژی جمعە کرا بڵاوببنەوە بەسەر زەوییدا ، وە دوای ڕۆژیی خوا بکەون وە یادی خوا بکەن بە زۆریی بەڵکو ڕزگارتان بێ(١٠)**

ئەم دووانە ئەوەندە گرنگە ، ئایین داینـاوە لەجێی دوورکـات لـەنوێژی نیوەڕۆ ، کەلەنوێژی جمعەدا ئەبێ بەدوورکات ، وەگوێ کـرتن لەدووانەکـەش لەجیاتی دوورکاتەکەی ترە ٠

دوانی هەینی وەك فێر کردنێکی ناچاریی «تعلیمی اجباریی» وایە بۆ نوێژ کەران ٠

فەرموودەی پێغەمبەرێجگار زۆرەلەبابەت گەورەیی نوێژی جمعەودەستووری پاکیی و ڕێـكو پێکیـەوە ، وەك خـۆشتن و بـەرگی جـوان لـەبەرکردن و خۆبۆنخۆشکردنو ،سیرو پیاز نەخواردنو قسە نەکردن لەژووری جمعەو هەنگاو هەڵنەهێنان بەسەر مەردوما ٠

دوای بـاسی نوێـژی هەینیو خواپـەرستیی ، ئنجـا ئەچێتەوە سـەر باسی کسبو کارو دنیـاداریی ، ئەفەرموێ (فاذا قضیت الصلاة) ئنجا کە نوێـژی جمعە کرا (فانتشـروا فی الارض) بڵاوببنەوە بەسـەر زەوییدا (وابتغوا من فضـل الله) وە دوای ڕۆژیی خواو قازانجو سوودی جیهان بکەوون ، بـەڵام لەم کاتانەشـا ، خواتان لەبیر نەچێتەوە ، وەکو ئەفەرموێ (واذکروا الله) وە ناوی خوا بەرنو یادی بکەن ( کثیرا ) بە زۆریی ( لعلکم تفلحون ) تا ڕزگار ببن لەڕۆژی دواییدا ٠

ئەگێرنەوە کە ڕۆژێکی هەینی پێغەمبەر لەسەر دووانگەی مزگەوتی مەدینە خوتبەی جمعە ئەخوێنێ ، لەوکاتەدا کاروانێك لەشام ئەگەڕێتەوە ، بە دەغڵودانو خواردەمەنییەکی زۆرەوە ،وە بە گۆرانییو دەفلێدانەوە ئەچنە ناو شاری مەدینە، لەو حەڵەدا لەمەدینە گرانیی ئەبێ ، وە خواردەمەنی دەستناکەوێ ، جا لەترسی ئەوەی نەوەك ئەو خواردەمەنییە زوو بفرۆشرێو نەمێنێ ، زۆر لەدانیشتووانی مزگەوت هەڵئەستن ئەچنە دەرەوە ، دوانزە کەسیان نەبێ ، کە هەر چوار یارو یاوەرەکانی پێغەمبەریان تیا بووە ، وە پێغەمبەر بەجێدێڵن لەکاتی خوتبەخوێندنا ، ئنجا پێویستە قورئان لێرەدا دەرسێکی قورسیان بداتێ ، تا جارێکی تر شتی وا

وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا قُلْ: مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ اللَّهْوِ وَمِنَ التِّجَارَةِ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ (١١)

**کاتێك بازرگانیی یا کارێکی بێهووده ببینن بڵاوەی لێئەکەن بۆ لای ئەو بازرگانیيە ، وە تۆ بەجێدێڵن بە وێستاویی ، بڵێ : پاداشی لای خوا چاکترە لە شتی بێهودەو سەوداو مامەڵە ، وە خوا باشترینی ڕۆزیی دەرانە(١١)**

نەکەن ، وە بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دێتە خوارەوە ، ئەفەرموێ ( واذا راوا ) کاتێك ببینن (تجارة) بازرگانیيەك ( او لهوا) یا ببیەن دەنگی دەفویارییو کارێکی بێهووده ( انفضوا الیها ) بڵاوەی لێئەکەن بۆ لای ئەو بازرگانییو یارییە ( وترکوك ) وە تۆ بەجێدێڵن ئەی پێغەمبەر ئەکاتێکا کە تۆ ( قائما ) وێستاویتو لەسەر دوانگە دوان ئەدەیت (قل) بڵێ (ماعندالله) ئەوی لای خوا چنگێ ئەکەوێ لەپاداشی جمعەونوێژو دانیشتن لەخزمەت پێغەمبەراو گوێگرتن بە خونبەکەی (خیر) چاکترو بەکەلکترە (من اللهو) لە بیستنی تەپڵودەف (ومن التجارە) وە لەکڕینوفرۆشتنو سەودا کردن ( والله خیر الرازقین ) وە خوا باشترینی ڕۆزیی دەرانە .

## سوورەی « منافقون »ه

مدنی‌یە ، ١١ ئایەتە ، ١٧٩ ووتەیە ، ٧٧٦ پیتە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لەرۆژێکەوە کەپێغەمبەرو کۆچکەران کۆچیانکردووە بۆمەدینە ، تووشیان بووە به تووشی دەستەیەکەوە کە بەدییمەن مسلمانزو ، وەکی ترناپاک «منافق» بوون ، کەسەرۆکەکەیان عبداللەی کوڕی ابی کوڕی سەلوول بووە ، ئەم ناپاکانە ئەوەندەی زبانیان شیرین بووە لەگەڵ پێغەمبەرو هاوڕێکانیا ، هەزارئەوەندە دڵیان پیس بووە ، وە هەمیشە خەریکی درۆودەلەسەو کەڵەکو فڕوفێڵ بوون ، بەڵێ ئەوان به هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە ، ناپاکیی خۆیانیان ئەشاردەوە ، بەڵام ناوبەناو کەفوکوڵی ئەو ناپاکی‌یە سەرڕێژی ئەکردو کەمێکی دەرئەکەوت ، وە قورئان سەرکۆنەی ئەکردن . لەبەرئەوە هیچ سوورەتێکی مەدەنی نی‌یە کەئاماژە «اشارە»یەکی تیانەبێ بۆناپاکان، ئنجا یا بەئاشکرا، وەیا بەپەنهانیی، بەڵام‌هیچیان وەک ئەم سوورەتە بێ پەردە نی‌یە .

ئەم دەستەی ناپاکانە لە مەدینە پەیدا بوون ، چونکە پێغەمبەرو هاوڕێکانی لەمەککە ئەوەندە بەهێزو بەدەسەڵات نەبوون کەکەس لێیان بترسێ ، وەلەترسی ئەوان بەدییمەن مسلمان و وەکی ترناپاک‌بن ، بەڵکو لەمەککەدا بێبڕواکان زۆر بەهێزو مسلمانەکان زۆر زەبوون بوون ، تا به ناچاریی کۆچیانکرد بۆ مەدینە ، بەڵام لەمەدینە وا نەبوون ، بەڵکو پێغەمبەر لەپێش کۆچکردنیا بۆ مەدینە ، پەیمانی بەست لەگەڵ دوو تیرەی زۆر بەهێزی مەدینەیی کە «ئەوس»و «خەزرەج» بوون ، وە هیچ ماڵێك نەبوو لە مەدینەدا کە ئیسلامەتی نەچووبێتە ناوێوە ، لەبەر ئەوە هەرەبەکانی مەدینە یا مسلمانی بەڕاستی ، وەیا ناپاك‌بوون ، واتە به دییمەن مسلمان بوون ، وە نوێژیان ئەکردو ڕۆژوویان ئەگرت ، بەڵام ناو بەناو ناپاکی‌یان دەرئەکەوت ، وە هەوڵیان ئەدا بۆ پیینەکردنی ، وە سوێندیان ئەخوارد بۆ پێغەمبەر کە تۆ پێغەمبەرییت ، وە ئێمەش مسلمانیین ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم سوورەتە

سورة المنافقون

بسم الله الرحمن الرحيم

إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا: نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللهِ.
وَاللهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ. وَاللهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ (١)

**سوورەی « منافقون »ە**

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**کاتێك کە ناپاکەکان بێنە لات ئەڵێن : شەهادەت ئەدەین کە تۆ بەڕاستیی رەوانەکراوی خوایت خوا ئەزانێ کە تۆ رەوانەکراوی ئەوییت ، وە خوا شاهیدیی ئەدا کە ئەم ناپاکانە درۆزنن(١)**

**هاتە خوارەوە ، فەرمووی ( اذا جاءك المنافقون ) کاتێك کە ناپاکەکانی وەك عبداللەی کوڕی ابی‌و هاوڕێکانی ، بێنە لات ( قالوا ) ئەڵێن ( نشهد انك لرسول‌الله) شاهیدیی ئەدەین کە بە ڕاستیی تۆ رەوانەکراوی خوایت ، واتە ئێمە ناپاك نیین ، وە بەدڵ بڕوامان بە پێغەمبەرێتی تۆ هەیە ، بەڵام درۆ ئەکەن ، وە ئەیانەوێ بەم شەهادەتە، ناپاکی‌یەکەی خۆیان بشارنەوە، وە پێغەمبەرو مسڵمانەکان فریب‌بدەن ، لەبەرئەوە خوا بە درۆیان ئەخاتەوە ، دوای ئەوەی کە خۆی ، پێغەمبەریەتی پێغەمبەر جێگیر ئەکاتو ئەفەرموێ ( والله یعلم انك لرسوله ) خوا ئەزانێ کە تۆ رەوانەکراوی ئەوییت ، وە ئەو تۆی بە پێغەمبەریەتی ناردووە بۆ سەر هەموو ئادەمیی ٠**

**ئەگەر خوا لێرەدا ئەمەی ئەفەرمووایە ، وە بچوایەتە سەر بە درۆخستنەوەکەیان کە ئەفەرموێ «والله یشهد ان المنافقون لکاذبون» ، لەوانە بوو ، کە بە دڵ بهاتایە کە شەهادەتەکەیان بۆیە درۆیە چونکە ڕێکی‌بوون «واقع» نی‌یە ، کە ئەمە مەبەس نی‌یە ، بەڵکو ئەوی مەبەس بێ ئەوەیە کە دەمودڵیان یەك نی‌یە ٠**

**دوای ئەوەی کە خوا خۆی پێغەمبەرێتی پێغەمبەری جێگیر کرد ، ئنجا ئەفەرموێ ( والله یشهد ان المنافقین لکاذبون ) خوا شەهادەت ئەدا کە ئەم ناپاکانە درۆزنن لە شەهادەتەکەیانا ، چونکە بیروباوەڕی ئەوان ، ڕێکی شەهادەتەکەیان نی‌یە ٠**

إِتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللهِ ، إِنَّهُمْ ساءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٢) ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ، فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ ، فَهُمْ لاَ يَفْقَهُونَ (٣)

**سوێنده ( درۆ ) کانی خۆیان کرد به قەلغان ( ی سەریان ) ئنجا ( بەم بۆنەیەوە ) ڕێی خوایان بڕی ( لەمەردوم ) ، بەڕاستی ئەوان کارێکی بەدیان کرد(٢) ئەوە (ی که ووترا) لەبەر ئەوەبوو که بڕوایان هێنا لەپاشا بێبڕوا بوون ، ئنجا مۆر نرا بەسەر دڵیانا ، وه ئەوان تێناگەن(٣)**

**خولاسه ڕاست به قسەیەك ئەووترێ که هەم ڕێکی بوون ، وه هەم ڕێکی بیروباوەڕبێ ، کەواته ئەگەر بێبڕوایەك به پێغەمبەر بڵێ : « انك لرسول‌الله » هەرچەند ڕێکی بوونه ، بەڵام چونکه ڕێکی بیروباوەڕی بێ بڕواکه نی‌یه به درۆ ئەژمێررێ ، هەروەك قادیانی‌یەك که بڵێ : احمد قادیانی پێغەمبەره ـ درۆیه ، چونکه هەرچەند ڕێکی بیروباوەڕی خۆی بێ بەڵام ڕێکی بوون نی‌یه ٠**

**( اتخذوا ایمانهم ) سوێنده درۆکانی خۆیان کرد ( جنة ) به قەلغانو سوپەر بۆ خۆیان ، واته هەرچەند فرۆفێڵێك ، یا کەلەکو درۆیەك ، یا قسەیەکی خراپیان دەربکەوتایه ، ئەهاتن سوێندیان ئەخوارد ، که شتی وا نەبووه ، وه بەو سوێندانه خۆیان ئەپارست ، تا درێژه بدەن به فرۆفێڵیان ، وه جڵەوگیریی مەردوم بکەن لەمسڵمان بوونو یارمەتی‌دانی لەشکری ئیسلام ٠ وەکو ئەفەرموێ ( فصدوا عن سبیل‌الله( ئنجا بەم بۆنەیەوه ڕێی خوایان بڕی لەخۆشیانو لە مەردومیش ( انهم ساء ما کانوا یعلمون ) به ڕاستیی ئەوان کارێکی زۆر بەدیان کرد ، که ڕوویان وەرگێڕا له ئایینی ڕاست ، وه سوێندی درۆیان خوارد ٠**

**ئنجا هۆی ئەم سوێنده درۆیانه ، وه ئەم ڕێی خوا بڕینانەیان باس ئەکات ئەفەرموێ ( ذلك ) ئەو خراپانەیان که ووترا ( بانهم ) بەهۆی ئەوەوه بوو ، که ئەوان (امنوا) به زبان بڕوایان هێنا (ثم کفروا ) لەپاشا به دڵ بێبڕوا بوون ( فطبع علی قلوبهم ) ئنجا مۆر نرا به سەر دڵیانا ، وه دەرگای دڵودەروونیان داخرا،به جۆرێك که ئیتر قسەی ڕاست نەچێته ژوورەوه ، وه له قسەی ڕاست نەگەن ، وەکو ئەفەرموێ (فهم لایعقلون) ئەوان تێناگەن ٠ تێناگەن ٠**

وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ، وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ، كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ، يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ، هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ،

**کاتێك بیانبینیت بە قەبارەی زلیان سەرسامت ئەکەن ، وە ئەگەر قسە بکەن گوێ لەقسەکەیان ئەگرییت ، ئەڵێت ئەوان داری هەڵپەسێرراوون ، وا گومان ئەبەن هەموو قریوەیەك بۆ سەر ئەوانە ، هەر ئەوانن دوژمن ، خۆتیان لێبپارێزە**

سەرۆکی ناپاکەکان عبداللەی کوڕی ابیی کوڕی سەلوول ، پیاوێکی جوانی ڕێکوپێکی قسەزانی قسە ڕەوان بووە ، کە بهاتایەتە خزمەت پێغەمبەر ، پێغەمبەر ڕووی تێئەکردو گوێی بۆ ئەگرت ، ئنجا قورئان چەند وێنەیەکیان ئەگرێو نیشانی ئەدات ، لەوێنەی یەکەمدا ئەفەرموێ ( واذا رأیتهم ) کاتێك بیانبینیت ( تعجبك اجسامهم ) سەرسامت ئەکەن بە قەدوباڵای بەرزو قەبارەی زلو ڕێکوپێکیی ڕوخساریان ( وان یقولوا ) وە ئەگەر قسە بکەن (تسمع لقولهم) گوێ لە قسەکەیان ئەگریت ، واتە تەماشای دیمەنیان مەکە ، بەڵکو تەماشای دڵو دەروونیان بکە .

لەوێنەی دووەما ئەفەرموێ (کانهم) ئەڵێیت ئەو ناپاکانە ( خشب مسندە ) چەند کۆتەرە دارێکی ووشکنو هەڵپەسێرراوون بە دیوارا ، واتە هەرچەند زبان لووسو قسەڕەوانن ، بەڵام لەدڵا تێناگەن ، و لەگەڵ کۆتەرە دارا جیاوازیان نییە .

لە وێنەی سیهەما ئەفەرموێ (یحسبون) وا گومان ئەبەن (کل صیحة علیهم) هەموو قریوەیەك بۆسەر ئەوانە ، واتەترس وبیمیان گەیشتووە بەئەندازەیەك هەر کەسێك چرپەیەكبکات ، ئەوان وائەزانن قسەلەوان ئەکەن ، وەهەر دەنگێکبێ، ئەوە قسەبەوان ئەڵێین ، وەهەر تەقەیەکبێ ، ئەوە بۆسەرئەوان ئەچن ، چونکە ناپاکن ، وەپەردەیەکی تەنکیاندوە بەسەر خۆیانا ، هەمیشە لەوە ئەترسن کەبا لایبەرێ ، یا لەلایەکەوە پەردەکەیان بدڕێ ، وە نهێنییەکانیان دەرکەوێ ،

ئەو ناپاکانە هەرچەند نەفامو ترسنۆکن،بەڵام دوژمنێکی ئێجگار خراپن بۆ تێکدانو شێواندنی ناوخۆ ، لەبەرئەوە خوا پێغەمبەر ئاگادار ئەکاتەوەو ئەفەرموێ (هم العدو) هەر ئەوانن دوژمنی بەڕاستی لەناوتانا ، وە لەسوپاتانا (فاحذرهم) خۆتیان

قَاتَلَهُمُ اللهُ ! أَنَّى يُؤْفَكُونَ ؟! (٤)

خوا لەناویان بەرێ ! چۆن وا ڕوو وەرئەگێرن؟!(٤)

لێبپارێزە ، وەهەرگیز بەقسەیان هەڵنەخەڵەتێت ، ئەوان لەگەڵ ئێوەدا بەدڵی ئێوەو ، لەگەڵ دوژمنەکانتانا بەدڵی ئەوان قسە ئەکەن (قاتلهم‌الله) خوا بیانکوژێو لەناویان بەرێ(انی‌یؤفکون) چۆنوا ڕوو وەرئەگێرن لەڕێی‌ڕاستو ئایینی‌دروست؟

* * *

هەروا باسی ناپاکیی ئەم ناپاکانـە ئەکات ، کەهـەر ڕۆژەی گۆشـەیەکی دەرئەکەوێ ، وەهەرساتە ئاوازێکی تازەیان لێ دەرئەچێ ٠

ئەگێرنەوە کاتێک کەپێغەمبەر لەجەنگی «بنی‌المصطلق» ئەگەڕێتەوە ، لەسەر ئاوێک ئەخات بە خۆیو لەشکرەکەیەوە ، دووکەس لەسەر ئاو ئەچن بەگژ یەکا لە کۆچکەرانو یارمەتی‌دەران ، یارمەتی‌دەرەکەیان سەر بە عبدالله‌ی کوڕی ابی ئەبێ ، ئەویان هاوار ئەکاتە کۆچکەرانو ئەمیان هاوارئەکاتە یارمەتی‌دەران ، بەرەکەتدا کەس بەدەنگیانەوە ناچێ ، لەمە، سەرەک ناپاک‌عبدالله‌ی کوڕی ابی تووڕە ئەبێ ، ئەڵێ : «ئێمە دوای محمد کەوتین بۆ ئەوەی تێمان‌هەڵدەن ؟! ڕەحمەت لە پێشینان کە ووتوویانە سەگەکەت تێر کەیت ئەتخوا ، بەخوا کە گەڕاینەوە مەدینە ، ئەبێ گەورە دەست دارەکان ، بچووکـە بێ‌دەستەکان دەرکـەن» واتە ئێمـە کەیارمەتی دەرانیین ، ئەبێ کۆچکەران دەرکەین ، ئنجا ڕووئەکاتە هاوڕێکانی خۆی ، ئەڵێ : «ئەمە خۆتان‌بەخۆتانتان کرد، وولاتەکەتان خستە ژێردەستی ئەمانەوە، دارایی‌یەکەتان‌دابەش‌کرد بەسەریانا ، ئێستاش ئەگەر دەستتان بگرنەوە و هیچیان نەدەنێ ، بەجێتان‌دێلن ، وە ئەچن بۆ وولاتێکی‌تر ، کەواتـە هیچ مەدەن بەم کۆچکەرانەی کەلەگەڵ محمدان ، تابلاوەی لێ بکەن» ٠

ئەم قسانە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ، وە عبدالله‌ی کوڕی ابی زانی کە پێغەمبەر بیستوویەتی‌یەوە،خێرا چوو بۆلای‌و سوێندی بۆ خوارد کەمن ئەم‌قسانەم نەکردووە، کەئایەتەکانی پێشوو هاتنە خوارەوە ، وەدرۆی سـەرەک ناپاک ئـاشکرابوو ، هێندێک لەدەست و پێوەندەکەی خۆی پێی ئـەڵێن : چەند ئایـەتێکی توندو تیژ دەربارەتان هاتۆتە خوارەوە ، بچن بۆلای پێغەمبەر ، داوای لێ بووردنی لێ‌بکەن ، تالێتان ببوورێ ، وەداوای بەخشینتان بۆبکات لەبارەگای خوادا ، ئەوییش ڕوویان

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ: تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ، وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ(٥) سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ؟ لَنْ يَغْفِرَ اللهُ لَهُمْ! إِنَّ اللهَ لاَ يَهْدِ الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ(٦) هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ

---

کاتێك پێیان بووترێ : وەرن بۆ لای ڕەوانەکراوی خوا تا داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکات ، سەرپێچی ئەکەن ، وە ئەیانبینیت ڕوو وەرئەگێڕن لەکاتێکا کە ئەوان خۆیان بە گەورە ئەگرن(٥) بۆ ئەوان چوونیەکە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت یا نەیکەیت ؟ هەرگیز خوا لێیان خۆشنابێ ! بەڕاستی خوا ڕێنموونیی گەلی بەدکار ناکات(٦) ئەوان لەوانەن کە ئەڵێن : دارایی بەختەمەکەن بۆ ئەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەران

---

لێوەرئەگێرێ ، وەپێیان ئەڵێ : ئێوە وەختی خۆی بەمنتان ووت : بڕوابێنە ، بڕوام هێنا ، وە پێتان ووتم زەکات بدە ، زەکاتمدا ، ئێستا هیچ نەماوەتەوە ، ئەوەنەبێ بچم کوڕنووش بەرم بۆمحمد ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەمئایەتانە هاتنە خوارەوە ، فەرمووی (واذا قیل لهم) کاتێك بە ناپاکەکان بووترێ (تعالوا) وەرن (یستغفر لکم رسول‌الله) تاپێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکات لەبارەگای خوادا (لو وار رؤوسهم) سەرپێچی ئەکەنو ڕوو وەرئەگێڕن (ورایتهم) وە تۆ ئەوان ئەبینیت ( یصدون ) ڕوو وەرئەگێڕن ( وهم مستکبرون ) لەکاتێکا کە ئەوان بە دەعیەو دەمارن •

ئنجا خوا ڕوو ئەکاتە پێغەمبەرو پێی ئەڵێ ( سواء علیهم ) بۆ ئەوان چونیەکە (استغفرت لهم) ئایا داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت (ام لم تستغفر لهم) یا داوای لێخرشبوونیان بۆ نەکەیت ( لن یغفرالله لهم ) هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێ ( ان‌الله ) بەڕاستی خوا ( لایهدی القوم الفاسقین ) ڕێنموونیی گەلی بەدکار ناکات •

ئنجا باسی گۆشەیەکی تر ئەکات لەبەدکارییان ، ئەفەرموێ ( هم الذین یقولون ) ئەوان لەوانەن کە ئەڵێن بە هاوڕێکانی خۆیان ( لاتنفقوا ) دارایی بەختەمەکەن ، وە دەستگیرۆیی مەکەن ( علی من عند رسول‌الله ) بۆ ئەو

حَتَّى يَنْفَضُّوا، وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ، وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ
لَا يَفْقَهُونَ (٧) يقولون لئن رجعنا الى المدينة

**تا بلاوەی لێبکەن ، هەرچی گەنجینەهای ئاسمانانو زەویی هەیە هەمــووی هی خوایە ، بەلام ناپاکان تێناگەن(٧) (ناپاکەکان) ئەلێن ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە ،**

**کۆچکەرانەی کە لەگەل پێغەمبەران ( حتی ینفضوا ) تا بلاوەی لێبکەن ، واتە کە ئێوە هیتچتان نەدانێ ، برسییان ئەبێ ، ئەو حەلە لەبرسانا بلاوەی لێئەکەن ، وە پێغەمبر بەجێدێلن •**

**وا دیارە ئەم کردەوە نامەردانە ، هەر لەکۆنەوە هەیە ، وە هەرکەسێك رقی لەیەکێك بووبێ ، یا هەر گەلێك قینی لەگەلێکی تر بووبێ ،برسیی ، وە نامانگوور «محتاج»ی کردووە،ئەوە قورەیشییەکان کە لەمەدینە هەموو جۆرە پەیوەستییەکیان بڕیی لەپێغەمبەرو مسلمانەکان ، وە سێسال لەناو دۆلو دەرەیەکی دوور لە مەککە بەندیان کردن ، وە نەیانهێشت کەس بەلایانا بچێ ، وە هیچیان پێبفرۆشێ ، وە ژنیان لێمارە بکات ، بەبێ نانوئاو ، مانەوە لەو چۆلو بیابانەدا •**

**ئەوە ناپاکەکانی مەدینە ــ وەك ئەم ئایەتە باسیکرد ــ ئەیانویســت هیچ دەست گیرۆیییەکی کۆچکەرەکان نەکەن تا لەبرسانا بلاوەی لێبکەن •**

**ئەوە شیوعییەکان لەوولاتی خۆیانا کارتی تموین نادەن بە بڕوادارەکان ، تا بمرن لەبرسانا ، یا بێبڕوا ببن بەخوا ، یا دەست لەخواپەرستیی هەلگرن •**

**هەمیشە بێبڕوایان لە زۆرکۆنەوە هەر وابوون لەگەل بڕوادارانا تا ئەمڕۆ ، لەبیریان چۆتەوە ئەو قسە ڕاستو دروستەی کە لەپێش تەواوبوونی ئەم ئایەتەدا قورئان بییریــان ئەخاتەوە ، کــە ئەفەرموێ ( ولله خــزائن السماوان والارض ) هەرچی گەنجینەهای ڕۆزیی هەیە ، لەئاسمانەکانو زەوییدا ، هەمووی‌هی خوایەو بەدەست خوایە ( ولکن المنافقین لایفقهون ) بەلام ناپاکان تێناگەن ، کە ڕۆزیی چاکانو خراپان هەر بە دەست خوایە ، هەر وەك ڕۆژیی خراپان ئەدا ، ڕۆژیی چاکانیش ئەدا ، وە هەر وەك ڕۆژیی یەکێك ئەدا کە هۆی بە دەستەوەبێ ، ڕۆژیی کەسێکیش ئەدا کە هەرچی هۆبێ نییەتی •**

**لە دواییدا باسی هەلەی هەرە گــەورەی ناپاکەکان ئــەکات ، ئەفەرمــوێ (یقولون) ناپاکەکان ئەلێن (لئن رجعنا الی المدینة) ئەگەر لەم سەفەرە گەڕاینەوە**

لیحرجن الأعز منها الاذل ، وَ لِلهِ الْعِزَّةُ وَ لِرَسُولِهِ وَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ (٨)

بێگومان گەورەکان زەبوونەکانی لێدەرئەکەن ، هەر بۆ خواو بۆ ڕەوانەکراوی خواو بۆ بڕوادارانە گەورەیی ، بەڵام ناپاکان نازانن(٨)

بۆ مەدینە (لیخرجن الاعز منها الاذل) بێگومان گەورە دەستدارەکان ، بێ دەستە زەبوونەکان دەرئەکەن لە مەدینە •

مەبەستیان لــە دەستدار ، خۆیــانی ریسوای پەستی ترســنۆکی دووڕووی بێبڕوایە ، مەبەستیان لە بێدەست پێغەمبەرو مسلمانەکانە •

ئنجا خوا بەدرۆیان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ (ولله العزة) گەورەییو دەست داریی بۆ خوا (ولرسوله) و بۆ ڕەوانەکراوی خوا (وللمؤمنین) و بۆ بڕوا دارانە (ولکن المنافقــین لا یعلمون) بــەڵام ناپاکان نــازانن لەبەر نــادانییو سەرمەستی خۆیان •

ئەم گەورەییە ، دەرکەوت ، کاتێك کە پێغەمبەرو لەشکرەکەی گەڕانەوە لەو سەفەرە بۆ مەدینە ، لەگەڵ سەرەك ناپاکان ، عبداللهی کوڕی أبی ، کە سەرەك ناپاك گەیشتە قەراخ شاری مەدینە ، عبداللهی کوڕی لە بەردەمی باوکیا وێستاو شیری لێدەرهێنا ، وە بــە باوکی ووت : بەخــوا هەنگاوێك ناچیتە پێشــەوە تا پێغەمبەر ڕێت نەدا ، چونکە ئەوە گەورەو زاڵو دەستدار ، وە تۆیت پچووکو زەبوونو بێدەست ، سەرەك ناپاك پاشەوپاش گەڕایەوە تا لە دوای لەشکرەکەوە بە پێغەمبەر گەیشت ، وە قسەکەی عبداللهی کوڕی بۆ گێڕایەوە ، پێغەمبەر یەکێکی لەگەڵا نارد بۆ لای عبداللەی کوڕی سەرەك ناپاك ، کە ڕێی باوکی بدات تا بچێتە ناو شاری مەدینەوە •

تەماشای ئــەم نیشانی گەورەییە بــکەن کە خوا دایناوە بەســەر شانی پێغەمبەرو بڕوادارانــا ، کە هەردوکیانی کرد بە دەستەی خۆی ، وە لــە تەنشت خۆیەوە رایگرتن ، وە فەرمووی : ئەمە ئێمەین ، وە ئەمەیە دەستەی گەورەو زاڵو دەستداران •

* * *

ئنجا ئەو بڕوادارانەی کە لەگەڵ خۆی و پێغەمبەرا ڕایگرتن ، وە کردنی

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلاَ أَوْلاَدُكُم عَنْ ذِكْرِ اللهِ ، وَمَنْ يفْعَلْ ذَلِكَ فَأُلَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ(٩) وَأَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ، فَيَقُولَ : رَبِّ لَوْلاَ أَخَّرْتَنِي إلىَ أجَلٍ قَرِيبٍ ، فَأَصَّدَّقَ وَأَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ(١٠) وَلَنْ يُؤَخِرَ اللهُ نَفْساً

---

ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ماڵومناڵتان خەریکتان نەکەن لەیادی خوا ، هەرکەسێك وا بکات ئەوانە زیانکارن(٩) بەخت بکەن هێندێ لەو ڕۆژییەی پێمان داوون پێش ئەوەی مردن تووشی یەکێکتان ببێ ، ئنجا بڵێت : خوایە کاشکی مردنی منت دوابخستایە بۆ ماوەیەکی نزیك ، تا خێرم بکردایەو لە چاکانبوومایە(١٠) هەرگیز خوا هیچ کەسێك دواناخات (لە مردن)

---

بە دەستەی خۆی ـ بانگیان ئەکات و دەستیان ئەگرێ تا بەرزیان بکاتەوە بۆ ئەو پایە بەرزە ، وە دووریـان بخاتەوە لە کـردەوەی ناپاکان ، وە لـە ڕەووشتو خوویان ، وە پێیان ئـەڵێ (یا ایها الذین امنوا) ئەی ئەو کەسانەی کـە بڕواتان هێناوە (لا تلهکم اموالکم ولا اولادکم) ماڵو مناڵتان خەریکتان نەکەن (عن ذکر الله) لە یادی خوا (ومن یفعل ذلك) هەرکەسێك وا بکات ، واتە بەهـۆی ماڵو مناڵەوە لە خوا دوور بکەوێتەوە ، وە خوا فەرامۆش بکات (فاولئك هم الخاسرون) ئەوانە بە ڕاستی زیانکارن (وانفقوا) بەختبکەن لە ڕێی خواو بڕوادارانا (مما رزقناکم) هێندێك لـەو دارایییەی کە پێمـان بەخشیوون ، وە کردوومانـە بە ڕۆژییتان (من قبل أن یاتی احدکم الموت) پێش ئەوەی مردن یەخەگیری یەکێکتان ببێ ، وە هەرچێکی هەیە بەجێیبێڵێ ، بۆ ئەمو ئەو ، بێئەوەی شتێکی بۆ خـۆی پێشخستبێ (فیقول) ئەو حەڵە بڵێ (رب لولا اخرتنی) خوایە بۆچی مردنی منت دوا نەخست (الی اجل قریب) بۆ ماوەیەکی نزیکو کەم (فاصدق) تاخێرم بکردایە (واکن من الصالحین) وە لە چاکان بوومایە ، واتە ئەگەر دوات بخستمایە چاکەم ئەکرد ، وە لە چاکان ئەبووم ٠

بەڵام ئەمە نەبوومو نابێ ، وەکو ئەفەرموێ (ولن یؤخر الله نفسا) هەرگیز

اذا جَاءَ أجَلُهَا ، وَاللهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ (١١)

کاتێك کە (وەختی) هات ، وە خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن(١١)

خوا هیچ کەسێك دواناخات لە مردن (اذا جاء اجلها) کاتێك کە مردنی هات (والله خبیر) وە خوا ئاگادارە (بما تعملون) بەوەی کە ئەیکەن ئەی ئادەمیی ٠

سورة التغابن

بسم الله الرحمن الرحيم

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(١) هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ

---

**سوورەی «تغابن»**

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویی‌دان (بە زبانی حاڵ) ستایشی خوا ئەکەن ، هەرچی هەیە هی ئـەوە ، وە هـەرچی ستایش هەیـە هەمووی هـەر بۆ ئـەوە ، وە ئەو بەسەر هەموو شتێکا توانایە(١) خوا ئەو خوایەیە کە ئێوەی دروست کردووە ،**

---

**سوورەی «تغابن»**

**مدنی‌یە ، ١٨ ئایەتە ، ٢٤١ ووتەیە ، ١٠٧٠ پیتە**

**بسم‌الله الرحمن الرحيم**

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**(یسبح لله) بە پاکیی یادی خوا ئەکات (ما فی السماوات والارض) ئەوی لە ئاسمانەکانو زەویی‌دایە ، واتە هەرچی‌یان تیایە بە زبانی حاڵ ستایشی خوا ئەکەن (له الملك) هەر بۆ ئەوە پاشایی‌و خاوەنداریی ، واتە هەرچی هەیە لە بوونەوەرا هەموو فەرمانبەریی‌و گەردن کەچیی ئەو ئەکەن ، وە نیشان ئەدەن کە هەر ئەوە خاوەنو بەدەسەڵات (وله الحمد) وە هەر بۆ ئەوە ستایش ، واتە هەرچی ستایشی جیهانیان هەیە هەمووی هەر بۆ ئەو ئەچێتەوە ، چونکە هەر ئەوە کانگای هەموو چاکەیەك (وهو علی کل شیء قدیر) وە ئەو بەسەر هەموو شتێکا زاڵو توانایە ، ژیان ئەدا ، مردن ئەنێرێ ، هەژاریی ئەدا ، دەوڵەمەندیی ئەبەخشێ ، ڕێنموونیی ئەکات .**

**لە نیشانەی دەسەڵاتی خوایە ، ئەمانەی کە باسیان ئەکاتو ئەفەرموێ (هو الذی خلقکم) خـوا ئەو خوایەیە ، کە ئێوەی دروست کردووە لەسـەر سروشتێکی**

فَمِنْكُمْ كَافِرٌ وَمِنْكُمْ مُؤمِنٌ ، وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢)
خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ ، وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ،
وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ (٣) يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ، وَيَعْلَمُ مَا
تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ،

---

ئنجا هێندێکتان بێ بڕواو هێندێکتان بڕوادارن ، وە خوا بینایە بە هەر شتێك کە بیکەن(٢) خوا ئاسمانەکانو زەویی دروستکردووە بەڕاستیو دروستی ، وە زۆر بە جوانیی قەڵەمی کێشاوون وە هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە(٣) هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوییدایە خوا ئەیزانێ ، وە ئاگای لەو شتانەیە کە ئەیشارنەوەو ئاشکرای ئەکەن،

---

پاك ، لەگەڵ ئەمیشە (فمنکم کافر) هێندێکتان بێبڕوانو لە سروشت لائەدەن (ومنکم مؤمن) وە هێندێکتان بڕوادارنو لەسەر سروشتن (والله بما تعملون بصیر) وە خوا بینایە بە هەر شتێك کە بیکەن ، وە پاداشتان ئەداتەوە بە پێی کردەوەتان، کەواتە تا ئەتوانن لە خوا بترسن .

بە ڕاستی ئەو بەڵگەو نیشانانەی کە خوا دایناوون لەناو بوونەوەرا ، وە بە تایبەتی لەناو لەشی ئادەمییدا ، بۆ دۆزینەوەی خوا ، بەسن بۆ مەردومی ژیری خاوەن بیر .

لە دوای باسی دروستکردنی ئادەمیی ، ئنجا باسی دروست کردنی جیهان ئەکات بەم ڕێکوپێکییە ، ئەفەرموێ (خلق السماوات والارض) خوا ئاسمانەکانو زەویی دروست کردووە (بالحق) بە ڕاستیو دروستی ، وە بە جۆرێك کە گەورەیی خوا بگەیەنێ ، وە گەورەترین بەڵگە بێ لەسەر بوونی خوا (وصورکم فاحسن صورکم) وە قەڵەمی کێشاوون زۆر بە جوانیی ، باڵایەکی بەرزو ناو قەدێکی بارییكو ئەندامێکی ڕێکوپێك ، وە هەر یەکە بە قەد خۆی ، وە لە شوێنێکی تایبەتی وادا کە ئەبێ هەر لەو شوێنەدابێ ، خۆ ئەگەر بێیتە سەر باسی گیانو هۆشو گۆشو هەستو بیرو تێگەیشتن ، ئەوە هەر مەپرسە کە چەند ووردو بارییكو ڕێکوپێكو گرنگە (والیه المصیر) وە هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوەی هەموو کەسێك لە ڕۆژی دواییدا .

( یعلم ما في السماوات والارض ) هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوییدایە خوا ئاگای لێیە (ویعلم ما تسرون وما تعلنون) وە ئاگای لەو شتانەیە کە ئەیشارنەوەو

وَاللهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (٤) أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ
قَبْلُ فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٥) ذَلِكَ بِأَنَّهُ
كَانَتْ تَأْتِيهِمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ، فَقَالُوا: أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا ؟

وە خوا دانایە بەوەی کە لەناو دلاندایە(٤) ئایا پێتان نەگەیشتووە دەنگو باسی ئەوانەی کە بێبڕوا بوون لەمەپێشو چەشتیان تۆڵەی کاری خۆیان ، وە بۆ ئەوان هەیە سزای بەئێشوئازار(٥) ئەمە بەهۆی ئەوەوەبوو، کە فرستادەکانیان بۆئەهات بەنیشانەی ڕووناکەوە ،ئەیانووت: ئایائادەمی (یەکێلەخۆمان) ڕێنمونیمانئەکات

ئاشکرای ئەکـەن (والله علیم بـذات الصدور) وە خوا دانایە بـەوەی کە لـەدڵی مەردومانایە •

* * *

دوای ئەوەی کەخوا نیشانەی هێنایە وەلەسەر گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی ، کە هەر ئەو ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە ، وە قەڵەمی مەردومی کێشاوە بەجوانیی ، وەئاگادارە بەهەموو شتێکی ئـاشکراو نهێنی ـ ئنجا هاوبەش پـەیدا کەرەکانی مەککە ئەترسێنێ لەسەر ئەم بێبڕواییەیان بە خواو پێغەمبەر ، وە باسی سەرەنجامی کاریان و ئەوسزایانەیان ئەکات کەتووشیان ئەبێ لەهـەردوجیهانا ، وە نموونەیان بۆ ئەهێنێتەوە بەو گەلانەی کە لەپێش ئەمانابوون ، وە پێغەمبەرانی خۆیانیان بەدرۆزنزانیوە ، تاخوا لەناوی بردن ، واتە ئەبوایە ئەمـان پـەندیان لەوان وەربگرتایە ، وەبهاتنایەتە سەر ڕێی ڕاست ، ئـەفەرموێ (الم‌یاتکم) ئایا پێتان نەگەیشتووە (نباالذین کفروامن قبل)دەنگ و باسی ئەوانەی کەبێبڕوابوون لەمەپێش ، وەك گەلی نـووحو عادو ثەموود ••• ؟ (فذاقوا وبـال امرهم) ئنجا چەشتیان تۆڵەی سەرەنجامی کاری خۆیان لەجیهانا کـەهێندێکیان خنکان لـەئاواو هێندێکیان لە ناوچوون بەبای ساردو هێندێکیان بەهەورەتریشقە (ولهم عذاب‌الیم) وە بۆ ئەوان هەیە لە ڕۆژی دواییدا سزای سەختو بە ئازار (ذلك) ئەو سزایەی کەتووشیانبوو(بانە)بەهۆی ئەوەوەبوو(کانت تاتیهم رسلهم‌بالبینات)کەفرستادەکانیان بۆئەهات بەبەڵگەو نیشانەی ڕووناکەوە (فقالوا) کەچی ئەیان ووت (ابشریهدوننا) ئایا ئادەمییەکی وەك خۆمان ڕێنمونییمان ئەکات ؟ واتە چۆن لە خۆمان یەکێك

فَكَفَرُوا وَ تَوَلَّوْا وَ اسْتَغْنَى اللهُ ، وَ اللهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (٦)

ئنجا بێبڕوابوونو ڕوویان وەرگێڕا، وەخواش بێنیازیی نوواند (بەلەناوبردنیان) وە خوا بێنیازو شایستەی ستایشە(٦)

ئەبێ بە پێغەمبەر لە ناوەندی ئێمەو خوادا ، واتە خوا ئەگەر پێغەمبەری ئەنارد بافریشتەیەکی لەئاسمانەوە ، بناردایە .

بێبڕواکانی مەککەش هەرئــەم خراپەیەیان ئەگرت ، ئەیــان ووت : چۆن ئادەمیی یەکی وەك خۆمان ئەبێ بەپێغەمبەر ، وایان ئەزانی کەپێغەمبەر ئەبێ هەرفریشتەبێ ، نەیان ئەزانی کەباوی خوالەســەر ئەوەیە کــەپێغەمبەر ئەبێ هەر ئــادەمیی بێ ، تــا لەگــەڵ مەردومانــا تێــکەڵ ببێ ، وە بــە گوفتــارو کــردار ئامۆژگاریان بکات ، وەئەوانیش ئەم بکەن بەسەر مەشقی خۆیان ، وە لەهەموو شتێکا چاوی لێبکەن و دوای بکەوون ، وەپرسیاری لێبکەن ووەرامی لێ وەرگرن، لەگەڵ ئەمیشە چەندە جیاوازیی هەیە لەناوەندی ئادەمیی وفریشتەدا ، زۆر جار ئەوەندەش جیاوازییهەیە لەناوەندی ئادەمی یەك وئادەمییەکی ترا، کەخوا هەڵی بژاردبێ بۆسرووشی خۆی .

(فکفروا) ئنجا بێبڕوابوون بەپێغەمبەرەکانیان (وتولوا) وەڕوویان وەرگێڕا (واستغنیالله) وخواش بێنیازیی خۆی نوواند لەبڕواهێنانیان ، بەم ڕەنگە لەناوی بردن ودوایی پێهێنان (والله غنی) وەخوابێنیازە لەخواپەرستیی بەندەگان (حمید) شایستەی ستایشە .

ئەمە داستانی بێبڕوایانی پێشــوو بو ، کە تۆڵەی خۆیان وەرگــرت ، وە ئەمە بوو ئەو تۆڵەیــەی کە چەشتیان ، وە ئــەو سزایەی کە لــە ڕۆژی دواییدا چاوەڕوانیان ئەکات ، ئیتر دوای ئەمە چۆن گەلێکیتری تازەی وەك دانیشتووانی مەککە پێغەمبەرەکەیان بە درۆزن ئەزانن ؟ ئایا ئەمانیش چاوەڕوانی سەرەنجامی ئەوان ئەکەن ؟!

* * *

لەدوای باسی بێبڕوایی هاوبەش پەیداکەرەکان بەخوایەتی خواو پێغەمبەر یەتی پێغەمبەر ، ئنجا باسی بێبڕواییان ئەکات بەزیندووبوونەوە ، ئەفەرموێ

زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنْ لَنْ يُبْعَثُوا، قُلْ: بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ
لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ، وَذَلِكَ عَلَى اللهِ يَسِير (٧) فَآمِنُوا بِاللهِ
وَرَسُولِهِ، وَالنُّور الَّذِي أَنْزَلْنَا، وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٨)
يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ،

---

بێبڕواکان گومانیان برد کە ( لە ڕۆژی دوایی‌دا ) زیندوو ناکرێنەوە ، پێیان بڵێ ( ئەی پێغەمبەر ) نەء وا نی‌یە ، بەخوا زیندو ئەکرێنەوە ،لەپاشاناگادار ئەکرێن‌بەوەی کەکردووتانە، وەئەمە لەسەرخوائاسانە(٧)
ئنجا با بڕوابێنن بەخواو فرستادەی خوا ، وە بەو نوورو ڕووناکی‌یەی کە لەگەڵ پێغەمبەرا ناردومانە ( کە قورئانە ) ، وە خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن(٨)
( پاداشتان ئەداتەوە ) لەڕۆژێکا کە کۆتان ئەکاتەوە بۆ ( پرسینەوەی ) ڕۆژی کۆکردنەوە

---

(زعم‌الذین کفروا) بێبڕواکان گومانیان برد (ان‌لن یبعثوا) کە لەڕۆژی دوایی‌دا زیندوو ناکرێنەوە ، ئنجا خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ (قل) پێیان‌بڵێ (بلی) نەء وانی‌یە (وربی‌لتبعثن) سوێندبەخوا زیندووئەکرێنەوە لەڕۆژی دوایی‌دا (ثم‌لتنبوءن) لەپاشا ئاگادارئەکرێن (بماعملتم) بەوەی کەکردووتانە لەجیهانا لەکاری چاکو خراپ و گەورە و بچووك وئاشکراو پەنهان ، واتە بەری کردەوەی خۆتان ئەبینن (وذلك) وە ئەو زیندوو کردنەوەو ئاگادار کردنەوە بەکردەوەکانتان (علی‌الله یسیر) لەسەر خوا زۆر ئاسانە •

چی‌لەم سوێندی پێغەمبەرە بەخوای خۆی ، گەورەترە ، پێغەمبەرێك کە لە هەموو ژیانیا درۆیەکی نەکردبێ ، وەلەبەر ڕاستگۆیی خۆی هاوبەش پەیداکەرەکانی مەککە ناویان نابێ محمد امین ، ئێستا پێی بڵێ : «قل : بلی وربی لتبعثن» •

لەتەنشت ئەم سوێند خواردنی پێغەمبەرو بەهێزکردنەوەی زیندووبوونەوەیەوە ، ئنجا بانگی بێبڕوایان ئەکات بۆ بڕواهێنان بە خواو پێغەمبەرو ئەو قورئانەی کە لەگەڵ پێغەمبەرا نێرراوە ، ئەفەرموێ ( فامنوابالله ) ئنجا بڕوا بێنن بەخوا (ورسوله)و فرستادەی خوا کە محمدە (والنور الذی انزلنا) وە بەو ڕووناکی‌یەی کە لەگەڵ پێغەمبەرا ، ناردومانەتە خوارەوە ــ وەك قورئانی پیرۆزبێ ــ کە بە ڕاستیی ڕێی ژیان ڕوون‌ئەکاتەوە بۆ کەسێك کە بڕوای پێ‌بێ و کاری پێ‌بکات ( والله بما تعملون خبیر ) وە خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن •

بەڵێ خوا ئاگادارە بە کردەوەی بەندەگانی خۆی ، وە هەموو کەسێك ئاگادار ئەکاتەوە بەوەی کە کردوویەتی ( یوم یجمعکم لیوم الجمع ) لەڕۆژێکا کە خوا

ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنْ ، وَمَنْ يُؤمِنْ بِاللهِ وَيَعْمَلْ صَالِحاً يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ ، وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ، ذَلِكَ الفَوْزُ الْعَظِيمُ (٩) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ (١٠)

---

ئەو ڕۆژە ، ڕۆژی زیانباریی (بەدکاران)ە وە هەرکەسێك بڕوابێنێ بە خوا ، وە کردەوەی باش بکات ، خوا گوناهەکانی دائەپۆشێ ، وە ئەیخاتە ناو باخاتی بەهەشتێکەوە کە جۆگە ئاو بە بنکیانا ئەڕوا ، تیا ئەمێننەوە هەتا هەتایە ، ئەمەیە بەهرەمەندیی گەورە(٩) ئەوانەی کە بێبڕوابوون وە ئایەتانی ئێمەیان بە درۆ زانی ئەوانە هاوڕێی ئاگرن تیا ئەمێننەوە هەتا هەتایە ، وە (ئەوێ) جێی گەڕانەوەیەکی زۆر بەدە(١٠)

---

کۆتان ئەکاتەوە بۆ پرسینەوەی ڕۆژی دوایی ، کە هەرچی ئادەمیی و فریشتە هەیە تیا کۆئەبنەوە (ذلك) ئەو ڕۆژە (یوم التغابن) ڕۆژی زیانبارییە ، واتە لەو ڕۆژەدا هێندێ کەس شادمان و هێندێکیش زیانبار و زەرەرمەند ئەبێ ، بەم ڕەنگە بڕوادار بە بەهەشت و پاداشی خۆشی و بێبڕواش بە دۆزەخ و تۆڵەی ناخۆشی خۆی ئەگات ، ئنجا دۆزەخیی بەرانبەر بە بەهەشتیی زیانبارە ، وەك ئەو دوو دەستەیە گرەویان کردبێ لەدەستپێشکەریی لەبڕوادا ، وە دەستەی یەکەم لەدەستەی دووەمی بردبێتەوە ، وە دەستەی دووەم دۆڕاندبێتی و زیانبار بووبێ وایە ، هەروەك ئایەتی پاشوو ئەمە ڕاقە ئەکات ، کە ئەفەرموێ ( ومن یؤمن باللّه ) هەرکەسێك بڕوابێنێ بەخوا ( ویعمل صالحا ) وە کردەوەی باش بکات ( یکفر عنه سیئاته ) خوا گوناهەکانی دائەپۆشێ ، واتە لێیخۆش ئەبێ ( ویدخله جنات ) وە ئەیانخاتە ناو باخاتی بەهەشتێکەوە ( تجری من تحتها الانهار ) کە جۆگەر ئاو بە بنکی درەختەکانیا ئەڕوات ( خالدین فیها ) تیائەمێننەوە هەتاهەتایە ( ذلك الفوز العظیم ) ئەوەیە بەهرەمەندیی گەورە ( والذین کفروا ) ئەوانەی کە بێبڕوابوون ( وکذبوا بآیاتنا ) وە ئایەتانی ئێمەیان بە درۆ زانی ( اولئك اصحاب النار ) ئەوانە هاوڕێی ئاگری دۆزەخن ( خالدین فیها ) تیا ئەمێننەوە هەتاهەتایە ( وبئس المصیر ) وە جێگایەکی زۆر بەدە دۆزەخ ، کە هەموو بێبڕوایان ئەگەڕێنەوە ناوی ٠

مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ، وَمَنْ يُؤمِنْ بِاللهِ يَهْدِ قَلْبَهُ ، وَاللهُ بِكُلِّ شَيءٍ عَلِيمٌ (١١) وَأَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ

---

هیچ ڕەنجێك ناگات (بە مەردوم) مەگەر بە فەرمانی خوا ، هەر کەسێك بڕوابێنێ بەخوا ، ڕێنموونیی دلی ئەکات ، وە خوا بە هەموو شت ئاگادارە(١١) فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بکەن ،

---

تا ئێستا باسی ئەوەی کرد کە ئادەمیی دوو جۆرن ، یەکێکیان بڕوادار بە خواو پێغەمبەرو ئەویتریان بێبڕوایە بە هەردوکیان ، ئنجا ئەفەرموێ هەرچی تووشی ئادەمی ئەبێ لەچاکەو خراپە بەپێی سەرنقیشت « قەزاوقەدەر » ی خوایە ، وە بەپێی دەستوورو یاوێکە کە خوا دایناوە لە بوونەوەرا ، کەوابوو پێویستە لەسەر هەموو کەسێك کە بەپێی تێگەیشتنی خـۆی هەوڵبداتو پارێزگـاریی بکات ، وە دوای ئەوە چاوەڕوانی سەرنقیشتی خوا بکات ، ئەفەرموێ ( ما اصاب من مصیبة) کەس تووشی هیچ دەردو ڕەنجێك نابێ (الا باذن الله) مەگەر بە فەرمانی خوا ، واتە هەرچییت تووشبێ چاکەو خراپە هەمووی بەپێی دەستوورو یاوێکـە کەخوا دایناوە لەمجیهانەدا ، کەواتە پێویستە لەسەر هەموو کەسێک بەپێی تەواناى خۆی هەوڵ بدات ، وە بۆهەموو کارێك لە دەرگای خۆیەوە بۆیبچێ ، وە لە هەموو ڕوویەکەوە ،سەروبەری ببەستێ ،ئنجاپشت ببەستێ بەخواو چاوەڕوانی سەرەنجامی کارەکەی بکات، ئەگەر نەبوو ، زۆر خەمبار نەبێ،چونکە ئەم بەپێی تەواناى خۆی هەوڵی بۆداوە ، ئنجا ئەگەر نەیزانێ بێ لەڕێی خـۆیەوە بۆی بچێ ، یالەهـەموو ڕوویەکەوە سەروبەری کارەکەی ببەستێ ، ئەوە سووچی خۆیەتی ، جگە لەوە کە لەم سەرنەکەوتنەدا دەرس وەرئەگرێ بۆ جارێکیتری ٠

لەجزمی یەکەم ، لاپەڕە (١٧٥) مەبەسمان داوەتەوە لە ئیزنی خوا ، بچـۆ بیخوێنەرەوە ٠

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کەبڕوابـە خوا ، چـرایدڵ و دەروونە ، ئەفەرموێ (ومن یؤمن بالله) هەرکەسێك بڕوابێنێ بەخوا ، وەبزانێ هەموو دەردو ڕەنجێك بەفەرمانی خوایە(یهد قلبه)خوا ڕێنموونیی دلی ئەکات وە ئەیخاتە سەر ڕێی ڕاست (والله بكل شی علیم) وەخوا بەهەموو شت ئاگادارە ٠

لەدوای باسی بڕواهێنان بەخوا لەئایەتی پێشوودا ، ئنجا ئەفەرموێ (واطیعوا الله) فەرمانبەریی خوا بکەن لەو شتانەی کە لە سەرتان دائەنێ (واطیعوا الرسول)

فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ(١٢) اللهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ(١٣) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ

ئنجا ئەگەر رووتان لێوەرگێڕا ئەوی لەسەر پێغەمبەری ئێمەیە هەر گەیاندنی ئایینە بە ڕوونی(١٢) خوای یەکتا بێجگە لەو ، خوایەکیتر نیە ، وە هەر لەسەر خوا با پشت ببەستن بڕواداران(١٣) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بە ڕاستی هێندێ لە ژنەکانو منالەکانتان دوژمنتانن ،

---

وە فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن لەو شتانەی کە لە خواوە پێتان ئەگەیەنێ (فان تولیتم) ئنجا ئەگەر ڕووتان لێوەرگێڕا، پێغەمبەر هیچگوناهێکی لەسەرنیە،چونکە (فانما علی رسولنا البلاغ المبین) ئەوی لەسەر پێغەمبەری ئێمە پێویست بێ هەر گەیاندنی فەرمانی خوایە بە ڕوونی ، کە ئەویش ، ئەمەی بە تەواوی بەجێ هێناوە •

ئنجا دوایی ئەم باسە ئەهێنێ ، بە باسی تاکو تەنیایی خوا ، وە ئەفەرموێ (الله) خوای یەکتا (لا اله الا هو) بێجگە لەو ، خوایەکیتر نیە (وعلی الله) وە هەر لەسەر خوا (فلیتوکل المؤمنون) با پشت ببەستن بڕواداران •

بەم ئایەتە باسەکە بوو بە باسی بڕواداران ، وە ئەمە بوو بە پردێك لە ناوەندی ئایەتەکانی پێشوو لەگەڵ ئایەتەکانی دوایی‌دا •

* * *

ژنو منال زۆر جار خوا لە بیر مەردوم ئەبەنەوە ، هەروەك زۆر جاریش مەردوم ئەگێڕنەوە لە پێویستی زۆر گەورەو پیرۆز ، وە ئەیبەن بۆ سەر تەمەعو دەستدرێژیی لەمولەو ، ئنجا بۆ بێدارکردنەوەی بڕوادارانو خۆ پاراستن لەم جۆرە شتانە ، فەرمووی (یا ایها الذین آمنوا) ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە (ان من ازواجکم واولادکم) بە ڕاستی هێندێ لە ژنەکانو منالەکانتان (عدوا لکم) دوژمنتانن ئەتانگێڕنەوە لە زۆر کاری خێرو ، ساردتان ئەکەنەوە لە زۆر ئیشی باش

فَاحْذَرُوهُمْ ، وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ
رَحِيمٌ (١٤) إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللهُ عِنْدَهُ أَجْرٌ
عَظِيمٌ (١٥) فَاتَّقُوا اللهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنْفِقُوا
خَيْرًا لِأَنْفُسِكُمْ ، وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ

خۆتانیان لێبپارێزن ، وەئەگەر ببوورنو چاوبپۆشنو خۆش(ببن لێیان) بێگومان خواش لێخۆشبووی میهرەبانە(١٤) مـاڵو منالتان هەر مایەی تاقیکردنەوەتانن ، وە خوا پاداشی گەورەی لەلایە(١٥) تا ئەتوانن لە خوا بترسنو (فەرمانی) ببیەن ، وە فەرمانبەریی بکەن ، وە باشترین ماڵتان بەخت بکەن بۆ گیانی خۆتان ، وە ئەوی پارێزراو بێ لە چرووکیی خۆی ، هەر ئەوانن

(فاحذرهم) کەواتە خۆتانیان لێ بپارێزن ، وە بۆ ڕەزامەندیی ئەوان خوا لە خۆتان مەڕەنجێنن •

مەبەس لەم ئایەتە ئەوە نییە کە بە چاوی دوژمن تەماشای ماڵو منال بکەنو دڵیان بڕەنجێنن ، بەڵکو مەبەس هەر ئەوەندەیە کە بۆ ئەوان خۆتان ڕووزەردی لای خواو شەرمەزاری لای مەردوم نەکەن ، وە ئەگەر ماڵو منال هەڵەیەکیان کرد لێیان ببوورن ، وەکو ئەفەرموێ (وان تعفوا) ئەگەر ببوورن لە هەڵەیان (وتصفحوا) وە چاو بپـۆشن لێیان بە بـاس نەکردنیـان (وتغفـروا) وە خۆشببن بـە داپۆشینی گوناهیان ، ئەوە بۆ خۆتان باشترە (فان‌الله غفور) بەڕاستی خوالێخۆشبوو (رحیم) میهرەبانە •

ئنجا ئەفەرموێ (انما اموالکم واولادکم فتنة) واتە ماڵو منالتان هەر مایەی تاقیکردنەوەتانن لای خوا ، بەم ڕەنگە دڵتان ڕائەکێشن بۆ لای خۆیان ، وە بەهۆی ئەوانەوە لە زۆر شتی خراپ نزیبك ئەکەونەوە ، کەواتە تا ئەتوانن ئیشێکی وا بکەن کە لەم تاقیکردنـەوەیەدا دەرچن (والله عنـده اجر عظیم) وە خـوا لە لایەتی پاداشی گەورە بۆئەو کەسانەی کەرەزای خواو پێغەمبەریان لەلالەپێشترە لەڕەزای ژن و منـاڵ (فاتقوا الله مااستطعتم) کـەواتە تائەتوانن لەخـوا بترسن ، وە خۆتان بپارێزن لە کردارو گوفتاری خراپ (واسمعوا) وە قسەی خوا و پێغەمبـەر ببیەن ولەگوێیگرن (واطیعوا) وەفەرمانبەرییان بکەن (وانفقوا خیرا لانفسکم) وە ماڵتان خەرجبکەن لەڕێی خوادا بۆ گیانی خۆتان ، تالەهەردو جیهانا بەهرەمەندببن (ومن یوق شح نفسه) وە ئەوی بپارێزرێ لەلایەن خواوە لە ڕژدییو چرووکیی (فاولئك

هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٦) إِنْ تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ. وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ (١٧) عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١٨)

---

**رزگار(١٦) ئەگەر قەرزبدەن بەخوا بەقەرزێکی باش خوا بۆتان زیاد ئەکا ، وە لێتان خۆش‌ئەبێ ، وە خوا سوپاس‌وەرگری لەسەرخۆیە(١٧) دانایە بەپەنهان‌و ئاشکرا زاڵی دروست کردارە(١٨)**

---

**هم المفلحون) هەر ئەوانەن رزگار ، واتە نە لە جیهانا ترس‌وبیمێ ، وە نە لە ڕۆژی دوایی‌دا دەردو سزایەکیان تووش ئەبێ ٠**

**ئنجا بۆ بەهێزکردنەوەی گیانی یارمەتی‌و دەست‌گرتنی هەژاران‌ولێ‌قەوماوان فەرمووی ( ان تقرضوا الله ) ئەگەر قەرز بدەن بە خوا ( قرضا حسنا ) بەقەرزێکی باش ، واتەهەر بۆخوابێ ، وەچاومو ، ڕووپامایی تیانەبێ (یضاعفه لکم) خوابەزیادە وە ئەتانداتەوە ، واتە لە دەچەندا نەوە ، تاحەوسەو چەندانە ، بۆتان زیاد ئەکات (ویغفر لکم) وە لێتان خۆش ئەبێ ئەگەر هەڵەیەکتان ببێ (والله شکور حلیم) وەخوا سوپاس وەرگری لە سەر خۆیە ، واتە ئەوی فەرمانبەریی خوابکات بە چەند پلە بەرەوژوورتر پاداشی ئەداتەوە ، وە پەلە ناکا لە سزای گوناهباڕانا ، سا بەڵکو تۆبە بکەن‌و پەشیمان بنەوە (عالم الغیب والشهادة) دانایە بە هەموو شتێکی پەنهان‌و ئاشکرا ، واتە ئاگادارە بەوەی کە ئاشکرای ئەکەن ، وە بەوەی کە لە دڵی خۆیانا ئەیشارنەوە (العزیز) زاڵە ، واتە ئەتوانێ تۆڵە بسێنێ لە کەسێك کە بێ‌فەرمانیی خوا بکات ، وە لەسەر ئەو بێ‌فەرمانی‌یە بمێنێتەوە (الحکیم) دروست کردارە ٠**

سورة الطلاق

بسم الله الرحمن الرحيم

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ .

**سوورەی تەلاقە**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**ئەی پێغەمبەر (بە مسلمانان بلێ) هەر حەلێ ویستیان ژن تەلاق بدەن با تەلاقیان بدەن لە عیدەیانا**

**سوورەی تەلاقە**

**مدنی‌یە ١٢ ئایەتە ، ٢٨٧ ووتەیە ، ١٠٦٠ پیتە**

**بسم‌الله الرحمن الرحيم**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**ئەم سوورەتە باسی چەند مەسەلەیەکی تەلاق وەکو شیردانمان بۆئەکا کە لە سوورەی «بقرە»دا باس نەکراوون ، جارێ پێشەکی باسی ئەو کاتەمان بۆ ئەکات کە چاك وایە بۆ پیاو ـ ئەگەر هاتە سەر ژن تەلاقدان ـ لەوکاتەدا تەلاقی بدات ، ئەفەرموێ(یاایها النبی)ئەی پێغەمبەری بەرێز ، بەمسلمانان بلێ(اذاطلقتم النساء) هەر حەلێ ویستتان ژن تەلاق بدەن لەوانەی کە چووبنە لایان(١) وە عیدەیان بە پاکو پیسی بێ(٢)**

**(فطلقوهن) با تەلاقیان بدەن (لعدتهن)لە عیدەدا ، واتە لە کاتێکا لەگەڵ تەلاقدانەکەدا بکەونە عیدەوە ، بەم ڕەنگە لە حەیزا نەبن ، وە لە پاکی‌یەکا نەبن کە مێردەکانیان چووبنە لایان ، تا ماوەی عیدەکەیان درێژ نەبێتەوە ، وە زوو بە زوو بتوانن شوو بکەن بە یەکێکی‌تر ٠**

---

**١ ـ چونکە ئەوانەی کە نەچووبنە لایان عیدەیان لەسەر نی‌یە تادرێژ ببێتەوە٠**

**٢ ـ چونکە ئەوانەی کە عیدەیان بەسێ مانگ بێ ، ئەوە لەمەولا ، هەر لەم سوورەتەدا باس ئەکرێ ٠**

بەلام ئەگەر لەحەیزا تەلاق دران ئەوحەلە تەلاقەکـە پێچەوانەی فەرموودەی خواو پێغەمبەر ئەبێ ، لەمەوە دەرئەکەوێ کەبۆژن تەلاق دان کاتێکی تایبەتی هەیە ئەویش پاکی یەکە کەمێرد لەوپاکی‌یەدا نەچووبێتە لای ژنەکەی ، واتە بۆمێرد نی‌یە لەهەموو دەمێکا ژن تەلاق‌بدات ، مەگەر لەکاتی ئەوپاکی‌یەدا نەبێ ٠

سیدقطب ئەفەرموێ : لەچەند فەرموودەیەکی تری پێغەمبەرەوە دەر ئەکەوێ کە وێنەیەکی‌تر هەیە بۆدروستێتی تەلاق، کە ئەویش سکپڕیی ژنەکەیە، بەجۆرێك کەبەتەواویی ئاشکرابووبێ ٠

مەبەس لەمە ئەوەنی‌یە کەتەلاق لەم دووکاتەدا نەبێ ناکەوێ ، بەڵکولەلای هەر چوار پێشەواکە ، تەلاق لەهەر کاتێکا بێ هەر ئەکەوێ ، وە خوا پێی‌ناخۆشە، بەلام لەم دوو شوێنەدا خوا زۆری پێ‌ناخۆشە ، وە پێغەمبەر لای باش نی‌یە ، ئنجا یەکێك تۆزێ شەرمی ببێ لەم دوو کاتەدا نەبێ ژن تەلاق نادات ، لەبەر فەرموودەی خواو پێغەمبەر ٠

ئەمەش لەبـەر ئەوەیە پیـاو کە لەسەر شـتێك توورە بوو لـە ژنەکەی ، وە هەڵچـوو خێـرا ئەکەوێتـە بیـری تـەلاق ، بـەلام کـە زانی ژنـەکەی لـە حەیزایە ، یا لە پاکی‌یەکایە کە چووبێتە لای ، ناچار بۆ ڕەزای خـواو پێغەمبەر تەلاقەکەی دوائەخات تا ئەو ماوەیەی کە شەرع دایناوە ، تەواو ئەبێ ، واتـە دە پانزە بیست ڕۆژێکی بە سەرا تێ‌ئەپەڕێ ، ئەو حەلە لەسەدا ٩٩ی تووڕەیی‌یەکەی بەسەرئەچێ ، وە لەتەلاقەکە پەشیمان ئەبێتەوە ، یاخۆ ، کە زانی ژنەکەی سکی هەیە لەسەدا ٧٥ پەشییمان ئەبێتەوە لەو تەلاقە ، بەلام ئەگەر پەشیمان نەبووەوە ، ئەوە نیشان ئەدا کە ئەو پیاوە ئەو ژنەی ناوێ ، وە هەر تەلاقی ئەدا با سکیشی بێ ، کەواتە ، بە مەرجگرتنی پاکی‌یەك کە چوونە لای تیا نەبێ ، بۆ ئەوەیە کە بە تەواویی دەرکەوێ کە ژنەکە سکی نی‌یە ، وە بە مەرجگرتنی ئاشـکرابوونی سك ، بۆ ئەوەیە کە پیاوەکە گومانی نەبێ لەسکی ژنەکەیا ٠

کەسێك لەم ئایەتەو لەفەلسەفەکەی ووردبێتـەوە ، تێ‌ئەگات کە ئـاینی ئیسلام تا چ ئەندازەیەك مەبەستێتی ، مانەوەی ژیانی ژنو مێردیی ، وە تێ‌ئەگات کە تەلاق وەك زەهرێك وایـە کە لەگـەل دەرمانا تێکەڵ بکرێ ، ئـەبێ زۆر بـە ووردیی ، وە بە کەم‌وکوڕیی بەکاربێنرێ ٠

وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ ، وَاتَّقُوا اللهَ رَبَّكُمْ ، لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ ، وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ ،

---

وە عیدەی (ژنەکانتان) هەلژمێرن ، وە لە خـوا بترسن ، ئەو ژنانە دەرمەکەن لە خانوکانی خۆیان (تا لە عیدەدان) وە خۆشیان با دەرنەچن مەگەر کارێکی ناشیرین بکەن ،

---

( واحصوا العدة ) وە عیدەی ژنەکانتان هەلژمێرن ، بەم ڕەنگە بزانن کەی دەستپێئەکاتو کەی تەواوئەبێ ، تا زیاد لە ئەندازەی خۆی درێژ نەبێتەوە ، وە ئەگەر داواکەرێکی ببێ ، لەکاتی خۆیا شووی پێبکات ، بەبێدواکەوتن ( واتقوالله ربکم) وە لە خـوا بترسن کە پەروەردگارتانە ، نە لە فەرمـوودەی دەربچن ، وە نە دەستدرێژییش بکەن بۆ مافی ژن ٠

ئنجا باسی هێندێ لەو مافانە ئەکات ، ئەفەرموێ ( لاتخرجوهن ) ئەو ژنـە تەلاقدراوانە دەرمەکەن ( من بیوتهن ) لەخانوکانی خۆیان ، واتە لەو خانوانەی کە هی مێردەکانیانەو ئەمان تیادانیشتوون ، لەکاتێکا کە ژنیان بوون ـ تا عیدەکەیان تەواوئەبێ ( ولایخرجن ) وە ژنە تەلاقدراوەکانیش با نەچنـە دەرەوە لـە مـالی مێردەکانیان ، تا عیدەیان تەواو ئەبێ ، وە ئەبێ لەو ماوەیەدا ئەو پیاوە لەگەل ژنە تەلاقدراوەکەیا بە تەنیا لە ژوورێکا کۆ نەبنەوە .

ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئەو ژنە لەو ماوەیەدا ـ کە تەلاقدراوە ـ لەبەرچاوی مێردەکەی دوورنەکەوێتەوە ، وە ناو بەناو کە لەژووری خۆی دێتە دەرەوە بەرچاوی بکەوێ وە ژیانی جارانی بیربکەوێتەوە ، کە پێکەوە بوون ، وە ئارەزووی یەکیان بەجێهێناوە ، وە دلی یەکیان ڕاگرتووە ، سا بەلکو خۆشـەویستییەکەی جـاران سەرهەلبداتەوە ، وە ئارەزووی ناو دوو توێی دلودەروون ، سەوزبێتەوە ٠

ئنجا ئەم ژنە تەلاقدراوانە دەرمەکەن لەو خانوانەی کە لەگەل مێردەکانیانا تیا دانیشتوون ( الا ان یاتین بفاحشة مبینة ) مەگەر کاتێك نەبێ کە ئەو ژنانـە کارێکی ناشرین بکەن ، لەدزیی یا داوێنپیسی ، یا دەمدرێژیی لەگەل کەسوکاری مێردەکەیانا ، یا خوێڕیی‌و سەر بە دەرەوەبن وە بە بێپرسی مێردەکەیـان بچنـە دەرەوە ، ئنجا ئەگەر یەکێك لەمانە ڕوویـدا ، ئەوحەلە بـۆ مێردەکانیان هەیـە دەریانکەن ، چونکە هیوای یەككەوتنەوەیان نەما ، وە تا لەوێبمێنێتەوە هیواکـە

وَ تِلْكَ حُدُودُ اللهِ ، وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ، لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا(١) فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ،

---

ئەمانــە سنوورانێکــی خوایین وە هــەرکەسێك لە ســـنوورانی خـــوا دەرچێ بێگومان ســـتەمی لەخۆی کردووە ، تۆ چووزانییت بەڵکو خوا دوای ئەوە کارێك بگێڕێ(١) ئنجا کە گەیشتنە کاتی خۆیان گلیانبدەنەوە بەباشی یا لێیان جیاببنەوە بە خۆشیی ،

---

دوورتر ئەکەوێتەوە ( وتلك ) ئەوانەی کە ووتران ، لەتەڵاقدانی ژن لەعیدەداو ، هەڵژماردنی عیدەو ، ترسان لەخواو ، دەرنەکردنی ژنی تەڵاقدراو لەو خانوومی کە تیابووە (حدوداللە) ئەندازەو سنوورێکن کە خوا داینراوون بۆ ئەوەی لێی لانەدەن ( ومن یتعد ) وە هەرکەسێك دەرچێ ( حدوداللە ) لەسنوورانی خوا ( فقد ظلم نفسه ) بەڕاستی ستەمی لەخۆی کرد کە ئەم فەرمانانی خوایەی شکاند ، وە خۆی کرد بە شایستەی سزای خوا ، لەگەڵ ئەمیشە کە مەردوم نازانێ خوا سبەینێ چ چــەرخێك ئەگێڕێ ، وە ئەگونجێ پەشیمان ببێتەوە ، وە بیەوێ ژنەکەی بباتەوە ، هەروەك ئەمە بە هەزاران جار ڕوویداوە ، وەکو ئەفەرموێ ( لاتدری ) تۆ چووزانییت ئەی ژن تەڵاقدەر (لعل‌الله یحدث بعد ذلك امرا) شایەد خوا کارێکیتر بگێڕێ دوای ئەو تەڵاقدانە ، بەم ڕەنگە پیاوەکە پەشیمان ببێتەوە ، وە بیەوێ ژنەکەی بباتەوە ، کەواتە تا ئەتوانن ژن تەڵاق مەدەن ، کە تەڵاقیشتان دان تاقە تەڵاقێکیان بدەن لە عیدەدا ، وە لە سنووری خوا دەرمەچن •

* * *

دوای باسی تەڵاقدانی ژنو هێشتنەوەی لەماڵی مێردەکەیا ، تا عدەی بەسەر ئەچێ ، ئنجا باسی قۆناغی دووهەم ئەکات ، ئەفەرموێ (فاذ بلغن اجلهن) ئنجا کە ژنە تەڵاقدراوەکان گەیشتنە ئاخرو ئۆخری عیدەکەیان (فامسکوهن بمعروف) گلیان بدەنەوە بە باشیی ، واتە بیانبەنەوە بۆ لای خۆتان پیاوانەو مەردانە ، بۆ ئەوەی پێکەوە بژین بە خۆشی ، نەك بۆ ئەوەی ئازارو سزایان بدەن ، وە دووبارەو سێبارە تەڵاقیان بدەن ، ئنجا سا یا بەم جۆرە بیانبەنەوە (او فارقوهن بمعروف) یا لێیان جیابنەوە بە خۆشیی ، بەم ڕەنگە وازیان لێبێنن ، تا عیدەکەیان تەواو ئەبێ ، ئەو

وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنكُمْ ، وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ، ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ،

---

وە دوو شاهیدی ڕاستگۆ بگرن لەخۆتان ، وە بۆ خوا ئەو شاهیدیبە بدەن • ئەمانە (پەندێکن) کە ئامـۆژگاریی ئـەوانەی پێئەکرێ کە بـڕوایان بە خـواو ڕۆژی دوایی بێ ،

---

حەلە چ مافێکیان بێ بەسەرتانەوە بە خۆشیی بیاندەنێ ، وە ئازاری دلیان مەدەن ، ئەوەك جارێکیتر بە مارەکردنـەوەیەکی تازە ، ببنەوە بە هاوبەشی ژیانتـان ، تا ڕووتان بێ تەماشایان بکەن .

ئنجا باسی شـتێك ئەکات کە پێویسـتە بکرێ لـە کاتی تەلاقـدانی ژن ، یا بردنەوەیا ، کە ئەویش ئامادەکردنی دوو شاهیدی باشی ڕاستگۆیە ، بۆ پاشەڕۆژ ، ئەفەرموێ (واشهدوا ذوی عدل منکم) دوو شاهیدی دادپرسی ڕاستگۆ بگرن لە خۆتان، واتە لە مسلمانان •

ئنجا ڕوو ئەکاتە شاهیدەکانو پێیان ئەڵێ (وأقیموا الشهادة لله) بۆ ڕەزای خوا ، ئەو شەهادەتە بدەن ، هەر کاتێك کە داواتان لێکرا ، واتە ئەم شەهادەتە نە بۆ ژنەکەیەو نە بۆ پیاوەکەیە ، بەڵکو هەر بۆ خوایە ، ئنجا لەبەر ئەوە بە ڕاستی شەهادەتەکە بدەن بەبێ زیادوکەم ، وە بەبێ زمان گۆڕین ، هەر ئێشو ئازارێکی بێ ، وە هەر ئەرکو ماندووبوونێکی تیابێ بۆ خوا ، وە لە ڕێی خوادایە •

ئنجا ئەفەرمـوێ (ذلکم) ئـەو شاهیدیگرتنـەتان لـە کاتی ژن تەلاقدانو هێنانەوەیانا ، وە ئـەم شاهێدیدانە لـە کاتی خۆیا ، پەنـدو ئامۆژگارییەکن (یوعظ به من کان یؤمن بالله والیوم الاخر) ئامۆژگاریی ئەوانەی پێئەکرێ کە بڕوایان بە خـواو ڕۆژی دوایی بێ ، واتە ئەوانـە بەهرەی لێوەرئەگـرن ، وە ئەوانەی کە لێی بەهرەمەند نەبن ، بڕوایەکی وایان نییە کە نرخێکی بێ •

بەراستی یەکێـك تروسکەی بڕوا لە دڵیـابێ لەم ئایەتە شەرم ئـەکات ، وە هەمیشە لەگەڵ خێزانی خۆیا ، نەرمو شلو گەرموگوڕ ئەبێ ، ئەو حەلە یا تەژیی لەگەڵیا پیاوانە ، وەیا لێی جیا ئەبێتەوە مەردانە •

دیسانەوە قورئان بڕوا بە خواو ترسان لێمان بیرئەخاتەوە ، وە ئەیکا بە ستوونی هەموو خێزانێك وە بەدەوارێکی هەڵدراو بۆ هەموو ژنومێردێك،ئەفەرموێ

وَمَنْ يَتَّقِ اللّٰهَ ، يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا (٢) وَيَرْزُقْهُ من حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ ، وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللّٰهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ،

وە هەرکەسێ لە خوا بترسێ خـوا ڕێی ڕزگاریی بۆ ئەکاتەوە(٢) وە ڕۆژیی بۆ ئەنێرێ لە لایەکەوە کە گومانی بۆ نەچێ ، وە هەرکەسێك پشت بە خوا ببەستێ ، خوای بەسە ،

(ومن يتق الله)هەرکەسێ لەخوا بترسێ ، وە لەترسی خوا خۆی بپارێزێ لەو شتانەی کەئایین قەدەغەیکردووە(يجعل له مخرجا)خوا ڕێی ڕزگاریی لەهەموو جۆرەتەنگانەیەك بـۆ ئەکاتـەوە ، وە دەربـازی ئەکات لـە خـەمو خەفـەتی هـەردو جیهـان ، کە ناخۆشترینیان ، خەموخەفەتی خێزانە ، واتە ئەگەر مەردوم لە ترسی خوا تەڵاق بە پێی فەرمـوودەی خوا بـدات ، ئەو حەڵـە خوا ڕێی بـۆ ئاسان ئەکات ، وە ئـەو تەنگانانەی کە یەکێکی‌تر تووشی ئەبێ ، ئەم تووشی نابێ ، ئنجا ئەگەر ویستی ، لە عیدەدا ژنەکە ئەباتەوە ، وە ئەگەر عیدەش بەسەر چووبوو بە ئاسـانیی مارەی ئەکاتەوە ، بێ‌ئەوەی پێویست بێ بە فروفیل (ويرزقه) وە ڕۆژیی بۆ ئەنێرێ (من حيث لا يحتسب) لە لایەکەوە کە لە بیریا نەبێ ، وە گومانی بۆ نەچێ (ومن يتوكل على الله) وە هەر کەسێك لە هەر کارێکا پشت بە خوا ببەستێ (فهو حسبه) خوای بەسە بۆ ئاسانکردنی هەموو کارێکی .

مەبەس لەم ئایەتی پشت بە خوا بەستنە ئەوەیە کە مەردوم دەستی دایە هەر کارێك ئەبێ بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیەوە دەستی بداتێ ، وە هەر شتێك لە بوونی ئـەو کارەدا دەخلی ببێ ئەبێ بیکا ، وە هەرچیش دەخلی ببێ لـە نەبوونیا ئەبێ دووری بخاتەوە ، کە هیچ نەما بیکا ئنجا ئەبێ بیداتە دەست خوا لە پێکهێنانی ئەو شتانەی کەپێویستن بۆجێ‌بەجێ‌بوونی ئەو کارە، کە ئەم نایانزانێ، وە لابردنی ئەو قۆرتو گرێیانەی کە لە لابەلایەکەوە پەیدا ئەبن .

مەبەس ئەمەیە ، نـەك ئەوەی کە دەست لـە هەموو کارێك هەڵگـرنو پالی لێ‌بدەنەوە ، وە بەتەمای خوابن هەموو کارێکیان بۆ بکات ، شتی وا لەم جیهانەدا نەبووەو نـابێ ، وەك قورئان ئەفەرمـوێ «وان ليس للانسان الا مـا سعى» واتە هەرچی مەردوم بە هەوڵو تەقەلای خۆی دەستی نەخات ، دەستی ناکەوێ .

إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ ، قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا(٣)

بەڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بەجێ‌دێنێ ، بێ‌گومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی داناوە(٣)

وە ئەفەرموێ «واعدوا لهم ماستطعتم من‌قوة» واتە ئامادە بکەن بۆدوژمنانتان ئەوی لە دەستتان دێ لە چەكو پێویستانی جەنگ ٠

ئەگەر ئەمە وابووایـە ، جارێ خوا کارێکی وای بۆ پێغەمبەر ئەکـرد ، وە ئیشێکی بـەبێ ڕەنجو تەقـەلای خـۆی بۆ جێ‌بەجێ ئەکـرد ، کە تەماشـای ژیانی پێغەمبەر ئەکەیـن شتی وا نابینین ، بەڵـکو هەر سەرکەوتنێـکی دەست کەوتبێ هەمووی بـەری هەوڵو تەقەلاو ڕەنجو کۆششی خۆیو مسلمانەکان بـووە ، وە هەرچەند هەڵەیەکیان کردبێ خێرا خوا پێی نووانندوون ٠

ئنجا هۆی ئەم پشت بەستن بە خوایەمان بۆ باس ئەکات ، ئەفەرموێ (ان الله بالغ امره) بەراستی خوا کارو فەرمانی خۆی بەجێ ئەهێنێ ، وە هیچی لەدەست دەرناچێ (قد جعل الله لکـل شیء) بێ‌گومان خوا گێراوێتی بۆ هەموو شـتێك لە هەژارییو دەوڵەمـەندییو سـاغییو نەخـۆشیو سەرکەوتنو ژێرکەوتـن (قدرا) ئەندازەیەك کـە لەوە زیـادو کەمی نابێ ، کەواتـە ئـەی مـەردمی بـڕوادار ، هەرحەلێك دەستت دایە کارێكو نەهات بە دەستتەوە ، وەرس‌مەبە ، چونکە هەموو کارێك کاتی خـۆی وە شوێنی خۆی وە ئەنـدازەی خۆی هەیە ، هیـچ شتێك لە بوونەوەرا بە گۆترە نی‌یە ، وە لەخۆیەوە نابێ ٠

* * *

لەمەپێش لەسوورەی « بقرە » دا باسی عیدەی ژنی حەیزدار کرا ـ کەسێ پاكوپیسی‌یە ـ وە فەرمووی « والمطلقات یتربصن بانفسهن ثلاثة قروء » واتـە ژنانی تەلاقدراو ، دان بەخۆیانا ئەگرن تا ماوەی سێ‌حەیز کە ئەم ئایەتە هاتـە خوارەوە ، زۆرکەس لەمەدینە ووتیان : گەلێ جۆری تر لەعیدە ماوە کە قورئان باسی لێ‌نەکردووە ، وەك عیدەی ژنێك کە لەحەیز وێستابێتەوە ، یا لەبەر منالیی هێشتا حەیزی پیانەهـاتبێ ، وە عیـدەی ژنی سکپر ، ئنجا بەم بۆنەیـەوە ئـەم

﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ، وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ، وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا(٤)﴾

ئەو ژنانەتان کە بێهیوا ئەبن لەحەیز ئەگەر گومانێکتان بوو عیدەیان سێ مانگە ، وە ( هەروا ) ئەوانەش کە ( لەبەر منالی ) حەیزیان پیانەهاتووە ، وە عدەی ژنانی خاوەن سك ئەوەیە کە سکەکەیان دابنێن ، هەرکەسێك بترسێ لەخوا ، هەموو کارێکی بۆ ئاسان ئەکات(٤)

ئایەتە هاتە خوارەوە فەرمووی ( واللائی یئسن من المحیض من نسائکم ) ئەو ژنانەتان کە بێهیوان لەحەیز ( ان ارتبتم ) ئەگەر کەوتنە گومانەوە ، بەم ڕەنگە نەتانئەزانی حەیزەکەیان کە وێستاوە لەبەر پیریی‌یە یا لەبەر شتێکی ترە (فعدتهن ثلاثة اشهر ) عیدەیان سێ مانگە •

مەبەس لەم ژنانە ئەوانەن کە هاوتەمەنەکانیان حەیزیان پیابێ ، بەڵام ئەگەر تەمەنیان لە پەنجاو پێنج تێپەڕیبێ ـ کە لەو دەمەدا هەموو ژنێك لە حەیز ئەوێستێتەوە ـ ئیتر جێی گومان نی‌یە •

هەروەك ئەم ژنانەوان کە لەدەوروبەری خۆناسینان«بلوغ»وەك ئەفەرموێ (واللائی لم یحضن ) ئەوانەی کە هێشتا حەیزیان پیانەهاتووە ، واتە ئەگەر لەمانیشا گومانتانبوو ،بەم ڕەنگە نەتانئەزانی ئەو بێحەیزی‌یەیان لەبەرئەوەیە کە خۆیان نەناسیوە ، یا لەبەر هۆیەکی ترە ، ئەمانیش وەك پێشوو عیدەیان سێ مانگە •

ئنجا باسی عیدەی سکپڕ ئەکات ئەفەرموێ : ( واولات الاحمال ) وە ژنانی سكپڕ (اجلهن) ماوەی عیدەیان (ان یضعن حملهن) ئەوەیە کە سکەکەیان دابنێن ، ئنجا ئەم سکپڕانە تەڵاقدرابن یا مێردیان مردبێ ، هەر کامێکیان بێ بە دانانی سکەکەیان عیدەیان بەسەر ئەچێ •

ئنجا ئامۆژگاریی ئەکات بە خۆپاراستنو لەخوا ترسان ، ئەفەرموێ ( ومن یتق‌الله ) هەرکەسێك بترسێ لەخوا،وە ئاگای لەفەرمانانی خوابێ‌لێرەدا(یجعل له من امره یسرا ) خوا کاری بۆ ئاسان ئەکات ، تەنانەت ئەوانەی ژنتەڵاق ئەدەن بە تاقە تەڵاقێك زۆر بە ئاسانیی ئەتوانن لەعیدەدا بیانبەنەوە ، وە ئەگەر

ذَٰلِكَ أَمْرُ اللهِ أَنْزَلَهُ إِلَيْكُمْ ، وَمَنْ يَتَّقِ اللهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا(٥) أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ ، وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ ،وَإِنْ كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ

---

ئەمە(ی کە ووترا) فەرمانی خوایە ناردوویەتە خەوارەوە بۆتان ، هەرکەسێك لە خوا بترسێ ، گوناهانی بۆ دائەپۆشێو پاداشی بۆ گەورە ئەکات(٥) (ژنانی تەڵاقدراو) دایانبنێن لە شوێنێکی وادا کە (خۆتانی) تیادائەنیشن بەپێی دارایی‌تان ، وە زیانیان پێمەگەیەنن ، بو ئەوەی تەنگیان پێهەڵچنن ، وە ئەگەر سکداربوون ،

---

هیلەشیان بەسەر چوبێ ئەوا ئەتوانن خوازبێنی‌یان بکەنەوە ، وە دووبارە مارەیان بکەنەوە ( ذلك ) ئەوەی کە ووترا ( امرالله ) فەرمانی خوایە ( انزله الیکم ) ناردوویەتە خوارەوە بۆتان •

دووبارە باسی ترس لە خواو پارێزگاریی ئەکاتەوە ، چونکە بە ڕاستی ئامۆژگاریی‌و لە خواترسان بناغەی هەموو کارێکە ، ئەفەرموێ (ومن یتق‌الله) هەرکەسێك لە خوا بترسێ ، وە خۆی بپارێزێ لە بێفەرمانیی ئەو (یکفر عنه سیئاته) خوا گوناهەکانی بۆ دائەپۆشێ (ویعظم له اجرا) وە پاداشی بۆ گەورە ئەکات ، واتە پاداشی زۆر بە زیادەوە ئەداتەوە .

* * *

دوای باسی عیدەی منداڵو پیرو سکپڕ ، ئنجا باسی نفقەی ژنێك ئەکات کە لە عیدەدا بێ لە خواردنو کاڵاو خانوو ، ئەفەرموێ (اسکنوهن) ژنانی تەڵاقدراو ، تا لە عیدەدان دایانبنێن (من حیث سکنتم) لە شوێنێکی‌وا کە خۆتانی تیا دابنیشن (من وجدکم) بە پێی دارایی‌تان ، واتە خۆتان بە پێی دەسەڵاتتان لە خانووی چۆنا دائەنیشن ، ئەبێ ئەو ژنە تەڵاقدراوانەشتان ، لە ماوەی عیدەدا لە خانوویەکی وادا خواردنو پۆشاکیانا ، نە لەهەستانو دانیشتنیانا (لتضیقوا عیهن) تا تەنگیان پێهەڵچننو وەڕسیان بکەن •

پۆشاکیانا ، نەلە هەستان و دانیشتنیانا (لتضیقوا عیهن) تاتەنگیان پێ هەڵچنن و وەڕسیان بکەن •

ئنجا بەتایبەتی باسی نفقەی سکپڕ ئەکات ، ئەفەرموێ (وان‌کن اولات‌حمل)

فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ، فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ، وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُمْ بِمَعْرُوفٍ

خەرجیان بکێشن تا سکەکەیان دائەنێن ، ئەگەر شیریان بۆ دان ئەوا ئێوەش کرێیان بدەنێ ، وە لەناو خۆتانا ڕاوێژ بکەن بە باشیی (بۆ کاروباری مناڵەکە) ٠

ئەگەر ئەوژنە تەڵاقدراوانە سکپڕبوون (فانفقوا علیهن) نفقەیان بدەن (حتی یضعن حملهن) تاسکەکەیان دائەنێن ٠

لێرەدا هەر باسی نفقەی سکپڕی کرد ، هەرچەند هەموو تەڵاقدراوێک تاڵە عیدەدابێ نفقەی ئەکەوێ ، چونکە ئەگونجێ مەردوم زەینی بچێ بۆئەوە بڵێ : ئەگەر سکپڕ هەر لە ڕۆژی تەڵاقدانیا سکەکەی دانا چۆن ئەبێ ئیتر نفقەی نەکەوێ یا ئەگەر نۆمانگ سکەکەی درنژ بووەوە ،چۆن ئەبێ نفقەی نۆمانگی بکەوێ؟لەبەر ئەمانە ، دانیپیانا کە سکپڕ نفقەی ئەکەوێ تا سکەکەی دائەنێ ، ئنجا ئەم سکە ، دوای تەڵاقەکە دایبنێ بە سەعاتێك یا بە نۆ مانگ دایبنێ ٠

ئنجا باسی شیردانی مناڵ ئەکات کە ئەگەر دایکە تەڵاقدراوەکەی شیری دایە ئەوا کرێی دایەنی‌یەکەی ئەکەوێ ئەفەرموێ ( فان ارضعن لکم ) ئنجا ئەگەر ئەم ژنە تەڵاقدراوانە شیریان دا بە مناڵەکانتان ( فآتوهن اجورهن ) کرێی شیردانەکەیان بدەنێ ، تا ژنەکەش پێی بژیی ، وە شیرەکەشی ووشك نەکات

ئەمە ئەوپەڕی یارمەتی‌یە بۆ دایکی تەڵاقدراو ، کە پێویستی نەکردووە لەسەری ، بەخێوکردنی مناڵەکەی خۆی بەبێ نفقە .

( واتمروا بینکم بمعروف ) وەلەناو خۆتانا ڕاوێژ بکەن ـ ئەی باوکو دایکەکان ـ لەبابەت ئیش‌وکارو قازانج‌و سوودی مناڵەکانتانەوە چ لەڕووی تەندرووستی‌و چ لەڕووی پێخوێندن‌و چ لەڕووی ڕەووشتوخوویانەوە ، واتە هەر دوولا گوێ لەئامۆژگاریی یەکتریی بگرن دەربارەی مناڵەکەیان ، وە هیچ لایەکیان پەلپ نەگرن ، بەم ڕەنگە نە دایك داوای مانگانەی زۆر ، وە نە باووك چرووکیی بکاتو دەستبگرێتەوە ، بەڵکو هەردوولا ، مناڵەکە بە پارچەیەك بزانێ لەجەرگ‌و دڵی خۆی ، وە هیچیان لەڕقی ئەویکەی تر ، داخی خۆی بە مناڵە بێ‌گوناهەکە نەڕێژێ ، وە کارێکی وا نەکات کە بەدبەختیی ژن‌ومێردەکە ، بەخەگیبری مناڵە

وَإِنْ تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى (٦) لِيُنْفِقْ ذُوسَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ ، وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللهُ ، لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إِلاَّ مَا آتَاهَا ، سَيَجْعَلُ اللهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْراً (٧)

وە ئەگەر تەنگیتان کرد (لەگەڵ یەکا) با ژنێکی تر شیری بداتێ(٦) با دەوڵەمەند بەپێی دەوڵەمەندیی خۆی خەرج بکات ، وە هەرکەسێك ڕۆژیی کوور بوو با بەپێی ئەوەی کە خوا داویتێ خەرج بکات ، خوا داوا لەکەس ناکات مەگەر بەپێی ئەوەی کە داویتێ ، خوا دوای تەنگی ئاسانی ئەدا(٧)

بێتاوانەکەش ببێ ٠

ئنجا ڕێگامان نیشان ئەدات لەکاتێکا کە باوکودایك ڕێنەکەوون لەسەر مانگانەی منداڵەکەیان ، ئەفەرموێ (وان تعاسرتم) ئەگەر تەنگیتان کرد لەگەڵ یەکتریدا ، بەم ڕەنگە باوکەکە چروکیی کرد ، یا دایکەکە داوای زۆری کرد (فسترضع له اخری) ئەو حەلە با ژنێکیتر شیر بدا بە منداڵەکە ، بە مانگانە ٠

ئنجا باسی ئەندازەی نفقە ئەکات ، ئەفەرموێ (لینفق ذو سعة من سعته) با دەوڵەمەند بەپێی دەوڵەمەندیيەتەی خۆی خەرج بکات بۆ ژنە تەڵاقدراوەکەیو بۆ منداڵە شیرە خۆرەکەی (ومن قدر علیه رزقه) وە هەرکەسێك ڕۆژیی کەموکوور بێ (فلینفق مما آتاه الله) با بەپێی ئەوەی کە خوا داویتێ ئازووخەی منداڵەکەی بدات (لا یکلف‌الله نفسا الا ما اتاها) خوا داوا لە کەس ناکات مەگەر بە پێی‌ئەوەی کە خوا خۆی داویتێ ٠

ئنجا دڵخۆشیی ژنو پیاوەکە ئەداتەوە لەسەر نەبوونیو کەم دەستیيەك کە بیانبێ ، ئەفەرموێ (سیجعل الله بعد عسر یسرا) خوا دوای تەنگیی ئاسانیی ئەدات ٠

* * *

دوای ئەوەی کە فەرمووی تەڵاق لە هەموو کاتێکا نابێ ، بەڵکو لە هێندێ کاتی تایبەتیدا ئەبێ ، وە دوای باسی جۆرەکانی عیدەو نفقەی عیدە ، وە جڵەوگیریی لە چوونە دەرەوە لە فەرمانانی خوا ، ئنجا هەڕەشە ئەکات لەوانەی کە بە گوێی ئامۆژگاریيەکانی پێشوو ناکەن ـ بە باسی سەرەنجامی ئەو گەلانەی کە لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیان دەرچوون ، وە ئەمە ئەکا بە پەندو ئامۆژگاریی ، وە دای ئەدروێ بەسەر شانو بە پێشی سەرا ، تا لە بیر نەچنەوە ، ئەفەرموێ

وَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِ ، فَحَاسَبْنَاهَا حِسَاباً شَدِيداً، وَعَذَّبْنَاهَا عَذَاباً نُكْراً (٨) فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا ، وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْراً (٩) أَعَدَّ اللهُ لَهُمْ عَذَاباً شَدِيداً، فَاتَّقُوا اللهَ يَا أُولِي الأَلْبَابِ، الَّذِينَ آمَنُوا قَدْ أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكُمْ ذِكْراً (١٠)

---

**زۆر لە دێهاتی (وشاری)یەکان سەرپێچی‌یانکرد لە فەرمانی پەروەردگاریان‌و فرستادەکانی ، ئێمەش پرسینەوەمان لەگەڵکردن ، بە پرسینەوەیەکی توند ، وە سزاماندان بە سزای ناخۆش(٨) تا (بە تەواویی) سزای کردەوەی خۆیانیان چەشت ، وە سەرەنجامی کاریان بوو بە زیانباریی(٩) خوا ئامادەی کردووە بۆیان سزای سەخت ، ئنجا لە خوا بترسن ئەی ئەو خاوەن تێگەیشتنانەی کە بڕواتان هێناوە ، بێ‌گومان خوا قورئانی بۆ ناردوونەتە خوارەوە(١٠)**

---

**(وکای من قرية) زۆر لە دێهاتیی‌و شاری‌یەکان (عتت عن امر ربها) سەرپێچی‌یانکرد لە فەرمانی پەروەردگاریان (ورسله) وە لە فەرموودەی پێغەمبەرەکانیان (فحاسبناها حسابا شدیدا) ئێمەش پرسینەوەی سەختمان لەگەڵ کردن ، وە یەك بە یەك تۆڵەی گوناهەکانمان لێ‌سەندن (وعذبناها) وسزامان‌دان (عذابا نکرا) بە سزایەکی زۆر ناخۆش (فذاقت وبال امرها) تا بە تەواویی سزای کردەوەی خۆیانیان چەشت (وکان عاقبة امرها خسرا) وە سەرەنجامی دوارۆژیشیان بوو بە زیانباریی .**

**ئەمە سزای جیهانیان بوو ، سزای ڕۆژی دواییشیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ (اعد الله لهم ) خوا ئامادەی کردووە بۆیان لە ڕۆژی دوایی‌دا (عذابا شدیدا) سزای زۆر سەخت .**

**ئنجا ڕووی بڕواداران وەرئەگێڕێ ، بۆ لای خۆپاراستن‌و لە خوا ترسان ، تا تووشی ئەو ئازارو سزایانە نەبن کە گەلانی پێش ئەمان تووشی بوون ، ئەفەرموێ (فاتقوا الله) لە خوا بترسن (یا اولی الالباب) ئەی ژیرانی تێگەیشتووان (الذین امنوا) ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بە خواو پێغەمبەرو ئەو قورئانەی کە خوا ناردوویەتە خوارەوە ، وەکو ئەفەرموێ (قد انزل الله الیکم ذکرا) بێ‌گومان خوا بۆی ناردوونەتە خوارەوە پەندو ئامۆژگاری‌یەکی بەرز کە قورئانە ، هەروەك بۆی**

رَسُولاً يَتْلُوا عَلَيْكُمْ آيَاتِ اللهِ مُبَيِّنَاتٍ لِيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ، وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللهِ وَيَعْمَلْ صَالِحاً يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ، قَدْ أَحْسَنَ اللهُ لَهُ رِزْقاً(١١)

---

(هەروەك بۆی ناردوون) فرستادەیەك كـە ئەخوێنێتەوە بەسەرتانا ئایەتانی خوا كە ڕۆشنكەرەوەن تا ئەوانەی كە بڕوایان هێنـاوەو كردەوە باشەكانیان كردووە دەریان‌بێنن لە تاریكستانی (بێ‌بڕوایی) بۆ ڕووناكی (بڕوا) ، وە هەركەسێك بڕوا بێنێ بە خوا ، وە كاری باش بكات ئەیخاتە ناو بەهەشتانێكەوە كە بە بنیانا جۆگە ئاوی زۆر ئەڕوا ، تیـا ئەمێننەوە هەتا هەتایە ، بێ‌گومان خـوا (لەوێ) ڕۆژیی چاكی بۆ ئامادە كردوون(١١)

---

ڕەوانە كردوون (رســولا) فرستادەیەك كـە پێغەمبەرە (یتلو علیـكم) ئەخوێنێتەوە بەسەرتانا (آیات الله) ئایەتانی قورئان كە فەرموودەی خوان (مبینات) لە كاتێكا كە زۆر بە ڕۆشنی باسی هەموو جۆرە مەسەلەیەكی ئایینی‌و ژیان ئەكات (لیخرج الذین آمنوا) تا ئەوانەی كە بڕوایـان هێناوە (وعملوا الصالحات)و كـردەوە باشەكانیان كردووە ڕزگـاریان بكات (من الظلمات) لە تاریكی‌یانی گومـڕایی (الی النور) بۆ ڕووناكی ڕێ‌نموونیی ٠

بڕوا تاقانە چرایەكی ڕووناكە لە دڵو دەروونی بڕوادارا ، ڕێگای خوای بۆ ڕووناك ئەكاتەوە ، هەروەك هەموو شتێكی تری بۆ ئاشكرا ئەكات ، كە بێتە ڕێی تا بەبێ پەردە هەموو شتێك ببینێ ، وە چی هەڵ‌ئەگرێ هەڵی‌گرێ‌و چیش بەجێ دێڵێ بەجێی بێڵێ ٠

بەڵام گومڕایی چەند تاریكی‌یەكی جیاجیایە ، وەك تاریكی هەواو هەوەس‌و تـاریكی دەعیــەو یاخــی‌بوون‌و تاریكی ناپاكی‌و ڕوو پامـایی‌و تاریكی گومـان‌و دوودڵی‌و ٠٠٠ مەردوم كە ئەم چرایەی لەخۆی كووژانەوە ، ئەو حەلە ئەكەوێتـە ناو گەلێ تاریكی‌یەوە ٠

( ومن یؤمن بالله ) وە هەركەسێك بڕوابێنێ بەخوا ( ویعمل صالحا ) وە كاری باش‌و پەسەند بكات ( یدخله جنات ) خوا ئەیباتە ناو بەهەشتانێكەوە ( تجری من تحتها الانهار ) كە بە بنیانا ئەڕوا جۆگە ئاوی زۆر ( خالدین فیها ) تیا ئەمێننەوە هەتا هەتایە ( قد احسن‌الله له رزقا ) بێ‌گومان خوا لەوێ ڕۆژیی زۆر چاكی بـۆ

أَللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ ،

خوا ئەو خوایەیە کە حەوت ئاسمانی دروستکردووە وە زەویی دروستکردووە بە وێنەی ئەوان ،

ئامادە کردووە ٠

* * *

دوای ئەوەی کە هاوبەش پەیداکەرەکانی مەککەی ترساند ، بەم ڕەنگە ئەگەر پێغەمبەرەکەیان بە درۆزن بزانن ، ئێوەش وەك گەلانی پێشوو لەناوئەچن ، وە تووشی ئەو سزایانە ئەبن کە ئەوان تووشی بوون ، ئنجا باسی گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوا ئەکات بە جۆرێکی وا کە ببێ بە هاندەری فەرمانبەریی ناین ، ئەفەرموێ (الله الذی) خوا خوایەکی ئەوتەوە (خلق سبع سماوات) کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە بە ژوور سەرتانەوە ، وەك «مریخ»و «مشتری»و «زحل»و «ئەورانووس»و «نیبتۆن»و «پلۆتۆ»و «ئێکس» بێ ، وە ئەم حەوتە هەر شەوەی لە لایەکەوە هەڵدێن‌و ئاوا ئەبن ، وە ئەم سووڕانەوەو هاتوچۆیەیان بە هەزاران هەزار ساڵە وەك یەکە ، بەبێ زیادوکەم ، وە بەبێ پاش‌وپێش‌کەوتن ٠

ئەگەر «عطارد»و «زهرە»ش ئەڵێن ئەوە ئاسمان نین بۆ زەویی ، وە بە ژوور سەری زەویەوە نین ، بەڵکو لە ژێر زەوی‌یەوەن ، چونکە لە زەویی نزیکترن بە ڕۆژ ، وە ئەو چەمەرە «مدار»یەی کە لە سەری ئەسووڕێنەوە ، بچووکترە لە چەمەرەی زەویی وە لەناو چەمەرەی زەویی‌دایە وەك لە جزمی یەکەمی تەفسیرەکەمانا باسمان کردووە لە لاپەرە (٩١و ٩٢و ٩٣و ٩٤دا) ٠

(ومن الارض مثلهن) وە زەویی دروست کردووە لە وێنەی ئەستێرە گەڕۆکەکانی‌تر لە مایە «مادە»و کەرەسەدا ، وە لە سووڕانەوەو خولانەوە بە گردی ڕۆژا ، وە لە وەرگرتنی ڕووناکیی‌و تین‌و تەووژم لە ڕۆژەوە ، وە لە خڕیی‌و گردیی‌دا ، کە ئەمە لە کاتی پێغەمبەرو هاتنە خوارەوەی قورئانا نەزانراوە ، وە کەس ئەمەی بە بیرا نەهاتووە ، کە ئەمە یەکێکە لە معجزەکانی قورئان(١) ٠

(١) ئەم مەعنایە لە تەفسیری جمال‌الدینی قاسمی‌و سید قطبەوە وەرگیراوە ، لە تەفسیرەکەوە دەرئەکەوێ کە «من» لە «من الارض»دا زیادە ٠

يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ ، لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ،
وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا (١٢)

---

فەرمانی خوا دێتە خـوارەوە لەناویانا تا تێبگەن کە خوا بەسەر هەمـوو شتێکا توانایە ، وە خوا بە زانینی دەوری هەموو شتێکی داوە(١٢)

---

(یتنزل الامـر بینهن) فەرمانی خـوا دێتە خوارەوە لە بـەینی ئاسمانەکانو زەویدا ، وە فەرمانی رەوایە لە هەردوکیانا ، وە لە هیچیانا پێچەوانەی دەستوورو باوی خوا نابێ ، ئەمەش (لتعلموا) بۆ ئەوەی تێبگەن (ان الله علی کل شیء قدیر) کە خوا بەسەر هەموو شتێکا توانایە (وان الله) وە بێگومان خوا (قد احاط بکل شیء علما) دەوری هەموو شتێکی داوە بە زانینی ، واتە ئاگای لە هەموو کارێکە ، وە بە زانینی لەگەڵ هەموو شتێکە ٠

سوورەی « تحریم » ە

مدنی‌یە ، ١٢ ئایەتە ، ٢٤٩ ووتەیە ، ١٠٦٠ پیتە

بسم الله الرحمن الرحیم

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەوەتی جیهــان جیهانەو ئادەمیی لـــه رووی دەورانـــه ، نه لـــه پێغەمبەرانو فرستادەگانو ، نـــه له پاشـــایانو سەرکۆمـــارانی جیهانا یـــەکێکی وەك پێغەمبەری ئیسلام هەڵکەوتووه که ڕووپەڕەی ژیانی وەك ئەم کراوەبێ بۆ هەموو کەسێك ، وه هەرچی نادیاریی بێ تیا نەبێ ٠ بەراستی هەرچی گوفتارو کرداری هەیه هەمووی نوسراوه ، وەهەرچی هەستان و دانیشتنی هەیه هـــەمووی ڕانوێنراوه ، تەنانـــەت ئەو شتانەی ئەگەر له یەکێکی ترا شارراب‌ێتەوه ، لەما بێ‌پـــەردە باس کـــراوه ، نەخوازلا قورئانی پیرۆز کەوەك جاسووس بەســـەریەوه وێستاوه ، هەرهەڵەیەکی کردبێ خێرا داوێتی‌یەوه به چاویا ، وه هەر چرپەو سرپەیەکی کردبێ لەگەڵ یەکێك له خێزانەکانیا خێرا فاشی کردووه ، وه هەر ئیشێکی کردبێ لەگەڵیانا خێرا باسی کردووه ، تا هەرچی ڕووپەڕەی ژیـــانی هەیه هەمووی ئاشکراو نمایان بێ بۆ هەموو ئادەمی‌یەك ، وه هەموو کەسێك بتوانێ ئـــەم ئادەمی‌یه له ترازووی ژیریی‌و بیرا بکێشێ‌و له سەنگی محەکی بدا ، تا هیچ گومانێکی نامێنێ ٠ یەکێك ئەم سوورەته بخوێنێتەوه تێ‌ئـــەگا که تا چ ئەندازەیەك قورئـــان بـــووه به ئاوێنەیەکی باڵانما بۆ نیشاندانی ئەم پێغەمبەرە گەورەیه ٠

ئەم سوورەته لەسەرەتاوه ڕووپەڕەیەکمان بۆ باس ئەکات له ژیانی خێزانێتی پێغەمبەر ، وه گۆشەیەکمان نیشان ئەدانه ئادەمێتی ئەولەگەڵ هێندێ له خێزانەکانیا

ئەگێرنەوە کەڕۆژێ پێغەمبەر ئەچێ بۆمالی حفصەی خێزانی ، بەلام لەوحەلەدا حفصە لەمالی‌باوکی ئەبێ ، پێغەمبەر دائەنیشێ بەتەنیا • لەوکاتەدا ماری‌یەی قبطی ـ کەکەنیزەکی پێغەمبەر بووە ، وەپاشای مصر بەدیاریی بۆی ناردووە ـ بەئیشێک ئەچێ بۆلای پێغەمبەر ، وەلەژوورەکەی حفصەدا ماوەیەک ئەمێنێتەوە ، لەوکاتەدا حفصە دێتەوە، کەئەزانێ ماری‌یە لەژوورەوەیە ئەویستێ لەبەرقاپی تادێتە دەرەوەو ئەڕوا،ئنجا ئەچێتە ژوورەوە دەست ئەکا بەگریان بەسەر پێغەمبەرا ، وە ئەڵێ چۆن ئەبێ کەنیزەکێکی هەوێی من بێتــە ژوورەکــەم ، وە لەگەڵ ئێوەدا بمێنێتەوە ، پێغەمبەر زۆری بەسەرا دێ و نەوازشی ئەکا بەلام بێ کەڵک ئەبێ ، تاناچار پێی ئەڵێ ، ئەگەر تۆ ، ئەمە لەبیبر خۆت بەریتەوە ، من ماری‌یەم لێ‌حەرام بێ ، بەلام پێی ئەڵی : ئەم‌قسەیە هەرلای خۆت بێ و نەچێتە دەرەوە حفصە بەمەرازیی ئەبێ ، بەیانی کەعائشەی هەوێی ئەبینێ ، هەرچەند ئەکا ناتوانێ قسەکەی لێ‌بشارێتەوە ، وە پێی ئەڵێ : مژدەبێ پێغەمبەر ماریەی لە خۆی حەرام‌کرد ، کە ئەمە ئاواتی هەردوولایەکیان بووە،خێراپێغەمبەر ئاگادارئەکرێ بەوەی‌کەحفصە قسەکەی‌گەیاند بەعائشە ، وەپێغەمبەریش ئەمە ئەدا بەگوێچکەی حفصەدا ، بەلام حفصە وائەزانێ کەعائشە پێی ووتووە ، لەبەر ئەوە لەپێغەمبەر ئەپرسێ کێ ئەمەی پێ ووتییت ؟ ئەویش ئەفەرموێ : خوا •

حفصە بەم کردەوەیەی کەکردیی ، ئاژاوەیەکی زۆرگەورەی نایەوەلەمالی پێغەمبەرا، بەم ڕەنگە عائشــە ژنەکــانی پێغەمبەر کۆنەکــاتەوە ، وەپێیان ئەڵێ کەپێغەمبەر ماری‌یەی لەخۆی حەرام کرد وە ئیتر نابێ ماریە لە شاری مەدینە دابمێنێتەوە ، پێغەمبەر کەئەمەی بیست حەفصەی تەلاقدا بە تاقەتەلاقێک ، وەهەموو ژنەکــانی بەجێ‌هێشت تامانگێک ، حەزرەتی عومەر کەبیستی حفصەی‌کچی تەلاقدراوە لە داخا ناخۆڵی کردبەسەرخۆیا پێغەمبەر کەبیستی‌عومەر خۆڵی‌کردووە بەسەرخۆ پایەشیمان بووەوە لەتەلاقدانەکەی ، وەلەبەر دڵی عومەر حەفصە هێنــایەوە ژێرنکاحی خــۆی ، وەدەنگ بلاوبۆوە کەپێغەمبەر هەموو ژنەکانی تەلاقداوە ، وەبەم بۆنەیەوە ژنەکانی خەمبار بوون چونکە زانی‌یان کە هەڵەیەکی زۆر گــەورەیان کردووە ، هــەروەک مسڵمانەکان هەموو خەفەتباربوون بۆ پێغەمبەر ، کەوا بەهۆی ژنەوە مالی لێ‌تێک چووە ، وە ئازار بەدڵی گەیشتووە •

ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە ، وەپێشەکی سەر زەنشتی پێغەمبەر ئەکا لەسەر قەدەغە کردنی مارەی‌یە لەخۆی ، فەرمووی (یاایها النبی) ئەی

سورة التحريم

بسم الله الرحمن الرحيم

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللهُ لَكَ، تَبْتَغِي مَرْضَاتَ
أَزْوَاجِكَ، وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١) قَدْ فَرَضَ اللهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ

---

**سوورەی «تحريم» ٠**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**ئەی پێغەمبەر بۆچی شتێك کەخوا بۆی حەڵاڵکردوویت تۆ لەخۆتی قەدەغە ئەکەیت، ئەکەیت ، ئەتەوێ ژنەکانت لێترازیی بن ، خوا لێخۆشبووی میهرەبانە(١) بێگومان خوا دایناوە بۆتان کردنەوەی سوێندەکانتان**

---

**پێغەمبەر (لمتحرم مااحل‌الله لك) بۆچی شتێک کەخوا بۆی حەڵاڵ کردوویت تۆ لە خۆتی قەدەغە ئەکەیت ، واتە دروست نییە شتی حەڵاڵ تۆلەخۆتی قەدەغە بکەیت، چونکە کەتۆ ئەمەت کرد مسڵمانانیش چاو لەتۆ ئەکەن ، وەئەمە ئەبێ بەباوێکی ناڕەوا (تبتغی مرضات ازواجك) بەمقەدەغە کردنیماریەیە لەخۆت تۆڕەزامەندیی ژنەکانت ئەوێ ، واتە لەبەر دڵی ئەوان ئەمە ئەکەیت ، ئەگینا شتی حەڵاڵ چۆن ئەبێ بە حەرام ، کە ئەمە ئەگونجێ لای خوا گوناھ بێ ، وەك دەرئەکەوێ لەدوایی ئایەتەکەوە ، کەئەفەرموێ (والله‌غفور رحيم) خوا لێخۆشبووی میهرەبانە ٠**

**وادەر ئەکەوێ ـ وەك سید قطب ئەفەرموێ ـ پێغەمبەر «درودی خوای لێبێ» لەگەڵ قەدەغە کردنی ماریەدا سوێندیشی لەسەر خواردبێ ، بۆیە خوا فدیەی لەسەردائەنێ ئەفەرموێ ( قد فرض‌الله لكم ) بەڕاستی خوا پێویستی کرد بۆتان ( تحلة ایمانکم ) کردنەوەی سوێندەکانتان ، واتە ئەو ڕێیەی کە بە سوێند لەخۆتانی ببەستن ، بە فدیە ئەتوانن بیکەنەوە ، لەکاتێکا کە سوێندەکە لەسەر کارێکی ناپەسەند بێ ، ئنجا لەو حەلەدا چاك وایە فدیە بدەن ، وە لە سوێندەکە لابدەن ٠**

**لەبابەت سوێند شکاندنەوە پێغەمبەر ئەفەرموێ: ئەگەر یەکێك سوێندیخوارد لە سەر کردن یا نەکردنی کارێك ، لەپاشا بۆی دەرکەوت کە لەکردنەکەدا ، چاك ، نەکردنەو لە نەکردنەکەدا ، چاككردنە ، با سوێندەکەی بخاتو چاکەکە بکات ،**

وَ اللهُ مَوْلاَكُمْ . وَ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ(٢) وَ اِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ
أَزْوَاجِهِ حَدِيثاً. فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ
وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ. فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ:

---

خوا دۆستی ئێوەیە وە ئەو دانای کاردروستە(٢) کاتێك کە پێغەمبەر بە نهێنی قسەیەکی درکاند لای هێندێ لە ژنەکانی ، ئنجا کە ئەو (ژنە) قسەکەی ئاشکرا کردو خواش پێغەمبەری ئاگادار کرد ، (پێغەمبەر) هێندێك (لە قسەکان)ی باسکردو هێدێکی باسنەکرد ، ئنجا کە پێیووت ، (ژنەکەی) ووتی :

---

وە فدیە بۆ سوێندەکەی بدات • ( والله مولاکم ) وە خوا دۆستو کارسازی ئێوەیە ، یارمەتیتان ئەدا لەسەر کارێك کە لاتان گران بێ ، بۆیە وا فدیەی سوێندی لەسەر داناوون ، تا لەهێندێ شتی قورسو گران رزگار ببن ( وهو العلیم ) وە خوا دانایە بە قازانجو سوودی بەندەگانی خۆی ( الحکیم ) کاردروستە ، هەرچیتان لەسەردابنێ هەمووی لەرووی کەلکو سوودو فەلسەفەوەیە •

ئنجا دەم ئەبا بۆ ئەو قسەیەی کە لە ناوەندی پێغەمبەرو حفصەی ژنی کراوە ، بەلام بێئەوەی دان بنێ بە قسەکەدا ، یا درێژەی پێبدا ، چونکە ئەمانە گرنگ نیین ، بەلکو ئەوی گرنگ بێ شتێکی ترە کە لێی وەرئەگیرێ ، ئەفەرموێ ( واذا سر النبی الی بعض ازواجە حدیثا ) کاتێك کە پێغەمبەر بەنهێنی قسەیەکی درکان لای هێندێك لەژنەکانی کەحفصە بوو، وەبەپەنهانی پێیووت :لە دوای من ابوبکرو عمر ئەبن بە خەلیفەی ئیسلام لەجێی من ، وە ئەم قسەیە لای کەس نەدرکێنیت ، بەلام حفصە ئەم قسەیەشی وەك قسەکەی تر دۆڕاند ، وە بە هەوێکەی خۆی ووت کە عائشەیە ( فلما نبات بە ) کاتێك کە حفصە قسەکەی ئاشکرا کرد لای عائشە (واظهرە الله علیە) وە خواش پێغەمبەری ئاگادار کرد بە درکاندنی قسەکە لەلایەن حفصەوە ( عرف بعضە ) پێغەمبەر هێندێکی لەقسەکان بە حفصە ووت کە باسی خەلافەتی ئەبوبکرو عمرە (واعرض عن بعض) وە چاوپۆشیی لەوێکەی تر کرد ــ کە باسی ماریەیە ــ واتە باسی نەکرد (فلما نباها) کاتێك کە پێغەمبەر خەبەری دا بە حفصە ( بە ) بەوەی کە خوا ئاگاداری کردبوو پێی ، حفصە وا تێگەیشت کە عائشە بە پێغەمبەری ووتووە ، لەبەرئەوە ( قالت ) حفصە ووتی بە

مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا ؟ قَالَ: نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ (٣)
إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا، وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ
فَإِنَّ اللهَ هُوَ مَوْلاَهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤمِنِينَ. وَالْمَلاَئِكَةُ
بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ (٤)

کێ ئەمەی پێ‌ووتییت ؟ فەرمووی خوای دانای ئاگادار پێی‌ووتووم(٣) ( ئەی حفصەو عائشە ) ئەگەر هەردوکتان با بدەنەوە بەلای خوادا ( ئەوا باشە ) چونکە بەراستیی دڵتان لایدا (لە ڕێی ڕاست) ، وە ئەگەر پشتی یەکتربگرن لەسەر (بەربەرەکانی) پێغەمبەر (زاڵ نابن بەسەریا) چونکە بێ‌گومان خواو جبرییل‌و مسڵمانانی باش یاری ئەوون ، دوای ئەوان فریشتە پشتیواننی(٤) •

پێغەمبەر ( من انباك هذا ) کێ ئەمەی پێ‌ووتیت ( قال ) پێغەمبەر فەرمووی ( نبانی العلیم الخبیر ) خوای دانای ئاگادار ، خەبەری داومێ ، کە ئاگای لەهەموو شتێکە •

ئنجا خوا ئەیەوێ نیشان بدا کە ئەوی ئەم ئاژاوەیەی نایەوە لەماڵی پێغەمبەرا ، وە دڵی پێغەمبەری ئازاردا ، گوناهێکی گەورەی کرد ، کە ئەبێ لێی پەشیمان ببێتەوە ، وە بە حفصەو عائشە ئەفەرموێ (ان تتوبی الی الله) ئەگەر پەشیمان بنەوە لەو گوناهەی کە کردتان ، وە با بدەنەوە بەلای خواو پێغەمبەرا ، جێی خۆیەتی ، چونکە (فقد صغت قلوبکما) بە ڕاستی دڵتان لە ڕێی راست لایدا • لەگەڵ ئەمیشە کە گەلەکۆمەکێی ئێوە لەسەر پێغەمبەر ، بۆ ئەوەی ئازاری دڵی بدەن ، زۆر کار ناکات ، چونکە خواو فریشتەو پیاوچاکانی لەگەڵان ، وەکو ئەفەرموێ (وان تظاهرا علیه) ئەگەر پشت بدەنە پشتی یەك ، لە دژایەتی پێغەمبەر زاڵ نابن بەسەریا ، چونکە (فان‌الله هو مولاه وجبریل وصالح المؤمنین) خواو فریشتەی سرووش‌و مسڵمانانی باشی لە خواترس ، یارو پشتیوانی ئەوون ( والملائکة بعد ذلك ظهیر ) وە هەرچی فریشتەی تریش هەیە هەموو هاوپشتو یارمەتی‌دەری ئەوون ، لە دوای خواو جبرییل‌و پیاوچاکان •

دوای ئەم هێرشە قورسەی کە بردی‌یە سەر حفصەو عائشە ، ئنجا ئەیان‌ترسێنێ

عَسَىٰ رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِنْكُنَّ : مُسْلِمَاتٍ، مُؤْمِنَاتٍ ، قَانِتَاتٍ، تَائِبَاتٍ، عَابِدَاتٍ ، سَائِحَاتٍ، ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَاراً(٥)

---

**هیوا هەیە ئەگەر ئێوە تەلاق بدا ، خوای ئەو لە جیاتی ئێوە ژنانێکی چاکتر لە ئێوەی بداتێ : فەرمانبەرانی ، بڕوادارانی ، نزاکارانی ، تەوبەکارانی ، خواپەرستانی ، کۆچکەران ، لە بێوەژنانو کچان(٥)**

---

بەم ڕەنگە پێیان ئەڵێ ئەگەر تەلاقتان بدات هیوا هەیە کە ژنانی لە ئێوە باشتری دەست بکەوێ ، وەکو ئەفەرموێ (عسى ربه ان طلقكن) ئومێد هەیە ئەگەر پێغەمبەر ئێوە تەلاق بدا خوای ئەو (ان يبدله ازواجا خيرا منكن) چەند ژنێکی باشتر لە ئێوەی بداتێ لەجیاتی ئێوە ، کە هەمووشیان(مسلمات)ژنانی‌مسلمانی(مؤمنات) بڕوادارنی (قانتات) نـزاکارانی (تائبات) تەوبـەکەرانی (عابدات) خواپەرسـتانی (سائحات) کۆچکەران لە ڕێی خوادا (ثيبات وابكارا) لـە بێوەژنانو کچان ، وەك ژنەکانی ئێستای کە هێندێکیان کچو هێندێکیان بێوەژن بوون •

بەم سـەرەتای سـوورەتە کە هاتــە خــوارەوە ، وە بەم ئامـۆژگاری‌یە بـۆ پێغەمبەرو خێزانــەکانی ، ئاژاوەکە کووژایــەوە ، وە هەموو شت چـووەوە جێی خۆی ، وە پێغەمبەر هیچ لە دنیا نەما ، وە ئەم پێغەمبەرە ، وە ئەم ماڵو خێزانە وەك سەعات کەوتەوە گەڕ ، وە دەستی کردەوە بە بلاوکردنەوەی ڕووناکیی باوەڕو زانین ، وە بە بناغەنانی ئایینێکی جیهانی‌و ، دروستکردنی گەلێکی نموونەیی‌و ، ڕێکخستنی دەوڵەتێــکی ئیسلامی ، لەسەر شـێوەیەکی تازەی خوایی کە تــا ئێستا نموونەی نەبینرابێ •

بەڕاستی ئەم پێغەمبەرە گەورەیە ، وە ئەم خێزانە پیرۆزە ، ئەمە ئەهێنێ ، کە خوای گەورەو مەزن بەمجۆرە بە تەنگی‌یەوە بێ ، چونکە خۆی پێغەمبەرەکەی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی بیـکا بە دواترینی پێغەمبەران ، وە بەسـەرمەشقی هەموو ئادەمی‌یان ، وە خێزانەکانیشی بکا بە نموونە ، بۆ هەموو خێزانێکی مسڵمانان ، جگە لەوە کە بە بۆنــەی قورئانەوە ژیانی پێغەمبــەر بووە بە نامەیەکی کــراوە بۆ هەموو ئادەمی‌یەك ، تا چین لەدوای چین ، بیخوێننو بیخوێننەوە تا جیهان جیهان

بێ ، وە هیچ رووپەڕەیەکی ژیانی لای هیچ کەسێك بە پەنهانی نەمێنێتەوە ، وە بە راستی هەموو کردەوەیەکی پێغەمبەر بۆ هەموو کەسێك دەرکەوێ ، وە ئاشکراو نابان بێ ٠

* * *

بە بۆنەی باسی پێغەمبەرو هێندێ لە خێزانەکانی لەم سوورەتەدا ، پێویستە ئێمەش لێردا زۆر بە کورتیی قسە بدەین لە پێغەمبەر خۆی ، وە لەو هاوسەرانەی کە بەرودوا هێناونی بەپێی مێژوو ٠

پێغەمبەر لە تەمەنی چل سالیدا کە بوو بە پێغەمبەر خاوەنی ژنوماڵو منال بوو ، وە لەگەڵ مەردومانا ، تێکەل ئەبوو لە بەیانییەوە تا ئێوارێ ، بەم پایە تازەیەی کە پێیدرا ، پێغەمبەر نەپچڕایەوە ، لەو ژیانەی کە لەسەری بوو ، وە دوور نەکەوتەوە لەو ماڵو منالەی کە لەگەڵیا بوو ٠

بەڵێ پێغەمبەریەتی دای نە مانی لە دلی پیرۆزی خۆشەویستی ماڵو منال ، وە دووری نەخستەوە لەو ژیانەی کە لەسەری بوو ، بەڵکو خوا دروستی کرد لەو تاقە مرۆڤە ئادەمییەتی پێغەمبەر ، وە کۆیکردەوە تیایا ، ئادەمیێتیو پێغەمبەرێتی ٠

ئادەمیێتی بە خۆیو هەموو پێویستانێکییەوە ، لە ویستنو ، نەویستنو ، حەزلێکردنو ، حەزلێنەکردنو ، خۆشەویستیو ، ناخۆشەویستیو ، ترسوبیمو ، یادو ، هیواو ، ئاواتو ، ئارەزووکردنو ، ساغیو نەخۆشییو ، مردن ٠

پێغەمبەریەتیش بە خۆیو هەموو پێویستانێکییەوە لە ژیرییو ، بیرو ، راستییو ، پاکییو ، زیرەکییو ، هێزی لەبیربوون «حافظه»و ، ئازاییو ، چاو قایمیو ، نەترسانو ، دلفراوانییو ، بێتەمەعیی ، وەك قورئان لە زۆر شوێنا ئەمە ئەدات بە گوێچکەی مەردوما ، ئەفەرموێ «قل انما انا بشر مثلكم يوحى الى انما الهكم اله واحد» واتە بلێ (ئەی محمد) من هەر ئادەمییەکم وەك ئێوە ، بەلام سرووشم بۆ ئەکرێ کە خوای ئێوە خوایەکی تاكو تەنیایە ٠

وە ئەفەرموێ «قل سبحان ربي هل كنت الا بشرا رسولا » واتە بلێ : خوا دوورە لە هەموو کەموکوورییەك ، من هەر ئادەمییەکی فرستادەم ٠

ئنجا ئەم پێغەمبەرە ، هەمیشە ڕوویەکی لە زەویو ، ڕوویەکی لە ئاسمان بووە ، بە ڕووی یەکەمی ، ئیشوکاری جیهانو ، پێویستانی ئادەمیێتی خۆی بەجێ ئەهێنا ، لە خواردنو ، خواردنەوەو ، نوستنو ، بێداربوونەوەو ، هەستانو ، ئیشکردنو ، تێکەلیی لەگەڵ خێزانو ماڵو منالیا ٠

بە ڕووی دووهەمی ، سرووشی لە ئاسمان وەرئەگرت ، وە زۆر نهێنی بۆ ڕوون ئەبووەوە ، وە فەرمانی خوای بە مەردوم ڕائەگەیاند ٠

بەڵێ پێغەمبەر ئادەمی‌یەکی فرستادە بوو ، لەئادەمێتی‌دا گەیشت بەپلەی هەرە بەرز لەهەموو ڕوویەکەوە ، هەروەك لەپێغەمبەرێتی‌دا گەیشت بە پلەی هەرە بڵنـد ٠

## ( باسێکی هاوسەرانی پێغەمبەر )

ئەم پێغەمبەرە گەورەیە لە زۆر لاوە دژمنانی دین هێرشیان بردۆتە سەر ، نەخوازەلا لەبابەت ئەم ژنانەی کە بە پیریی هێناونی ، وە ئەڵێن : چۆن ڕێی‌داوە بۆ خۆی ئەوی کە قەدەغەی کردووە لەمسڵمانان ؟

بەڕاستی لەسەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە فەلسەفەی ئـەم ژنانەی کە هێنـاونی نەزانراوە ، مەگەر لەم دوایی‌یەدا نەبێ کە ئاسۆی مێشکوبیر زۆر فراوان بووە ، ئێمە ئەگەر بە چاوێکی ئینساف ووردببینەوە لەم ژنانەی کە پێغەمبەر هێنـاونی ، تێ‌ئەگەین کە یا بۆ مەبەستێکی سیاسی ، وە یا بۆ مەبەستێکی تەشریعی ، وە یا بۆ مەبەستێکی ئادەمێتی بووە ، وە پێغەمبەر زۆر دوورە لەوەی کە بوترێ:ئەم ژنانەی بۆ ئارەزوویەکی نەفسی ، یا بۆ شتێکی تر بووە لە دەستکەوتنێکی دارایی ، یـا ناوو شۆرەت ، یا هەر شتێکی تر ، ئێمە لێرەدا باسێکی ئەم خێزانـانی پێغەمبەرە ئەکەین بە کورتیی ، وە هەر یەکێکیان کەمێك لەفەلسەفەی هێنانەکەی ئەدوێین ٠

یەکەمیان خەدیجە خاتوونی کچی « خووەیلد »ە ، کە لەپێش پێغەمبەرا دوو شووی تری کردووە ، وە بەرودوا هەردوو مێـردەکەی مردوون ، وە دارایی‌یەکی زۆری بۆ ماوەتـەوە ، ئەم ئافرەتـە زۆر بەناوبانگ بـووە لە مەککـەدا ، زۆر لە گەورەکانی قورەیش داوایـان کردووە شـووی پێ‌نەکـردوون ، بـەڵام ئافرەتێکی هاوڕێی خۆی نارد بـۆ لای حەزرەتی محمد کە پێی بڵێ : ئەگەر ئـارەزووی ژن هێنانت هەیە ئافرەتێکی وەجاخزادەی ڕێکوپێك هەیە ، ئەو ڕازی‌یە بە تۆ ، ئەگەر تۆش ڕازییت بەو ، بنێـرە بۆ خوازبێنی ، پێغەمبەر بە ئەبووتالبی مـامی ووت ، ئەویش چوو خوازبێنی بۆ کرد ، وە هەر لەوێ مارەکرا ٠ حەزرەتی محمد لەتەمەنی بیست و پێنج ساڵی‌و خەدیجە خاتوون لەتەمەنی چل ساڵی‌دابوو ٠

ئەم ژنو مێردە بیستو پێنج ساڵ پێکەوە ژیان ، وەلەو ماوەیەدا سێ کوڕو

چوارکچیان بوو ، کەناویان قاسمو طاهرو طیب و زێنەب و رقیە و امکلثوم و فاطمە بوو ، وە کوڕەکانی بە منالی مردن ، لەپێش کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە بە سێ ساڵ خەدیجە لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد ٠

ئایا حەزرەتی محمد ـ وەك دژمنەکانی ئەڵێن ـ مێباز بووە ؟! ئەوەتا کە لە بیستو پێنج ساڵی دابێوە ژنێکی چلساڵی هێناوە کەلەوەپێش دووشووی کردووە ، وەپانزە ساڵلە خۆی گەورەتر بووە ، وەبیستوپێنج ساڵپێکەوەبوون ، وەهەموو گەنجیی خۆی لەگەڵ ئەوا بەخت کردووە ٠

لەپاش ماوەیەك هاورێکانی پێغەمبەر زانییان کە پێغەمبەر ماڵی لێ تێك چووە ، وەکەسێکی نییە کەخزمەتی خۆیومناڵەکانی بکا ،دووسێ یەکیان هەستان چوونە لای «خەولە»ی کچی «حەکیم» کەبچێتە خزمەت پێغەمبەر و پێی بڵێ : کەئەم ماڵومناڵانە بەبێ کەیبانوویەك ناژیین ، وە عائشەی کچی ئەبوبەکرو «سەودە»ی کچی «زەمعە» ی بۆ هەڵدە ، کامیان ئارەزوو ئەکات مارەی بکات ، ئەوسەودەیەی کەچەندساڵبوو مسڵمان بووبوو لەگەڵ«سەکران»ی مێردیا، وەبەجووتە لەبەرزۆرو ستەمی بێبڕواکان کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە ، لەپاشا مێردەکەی مرد ، وە سەودە بەتەنیا مایەوە ، پێغەمبەر دوای پێنج مانگ سەودەی مارە کرد کەئافرەتێکی پیری، ناشرینی ، لەروڵاوازبوو ، وەمسڵمانێکی تێکۆشەری ، کۆڵ نەدەربوو ، ئەگەر پێغەمبەر نەیهێنایە ئەبووسەودە بچوایەتەوە لای ئامۆزا بێبڕواکەی یابێکەشتایە ، یابێبڕوای بکردایەتەوە ٠

ئەمەژنهێنانی پێغەمبەر بووە تاتەمەنی پەنجاو چوار ساڵیی ، دوای پەنجاو چوار هەرچێکی هێناوە یا بۆ ئامانجێکی بەرزو سیاسی ، وەیا بۆ ئامانجێکی دینی ، وە یا بۆ تەشریعێکی تازە بووە ، ئەمڕۆ ئەبینین زۆر سەرۆکی گەلانو ناودارانی جیهان هەوڵئەدەن کە لەگەڵ وەزیرەکانیانو سەرکردەکانیانا پەیوەندیی پەیدابکەن بەژن و ژنخوازیی ٠ بەڵکو زۆر لەسەر کردەی گەلانی بێگانانی دوور لەیەك ، ژن و ژنخوازیی ئەکەن بەمایەی نزیبك کەوتنەوەیان لەیەکتریی و بەهێزکردنی جێگای خۆیان ، ئنجا ئەم ئامانجەیە کەمین ئامانجی پێغەمبەربووە کە هەوڵی بۆداوە٠

لەدوای سەودە عائشەی کچی ئەبوبکری هێنا کەکچێکی زۆر زیرەك و ژیرو هەڵکەوتوو بووە ، وە دووسەد و پەنجا فەرموودەی پێغەمبەری لێ وەرگیراوە ، کە بوون بەسەرچاوەی زۆر لە ئەحکامی شەرعی ٠

لە ساڵی سیهەمدا حەفصەی کچی عومەری خەتتابی هێنا دوای مردنی مێردەکەی

بەهۆی برینێکەوە کە لە جەنگی بەدردا لێی کرابوو ، وە دوای ئـەوەی کە عومـەر بەدەمی خۆی حەفصەی دابە ئەبوبکرو نەیویست ، ئنجا دای بەعوسمان و ئـەویش نەیویست،ئنجا بەداخەوە چووبۆخزمەت پێغەمبەرو سکالای کردلەدەست ئەبوبکریش‌و عوسمانیش ، پێغەمبەر فەرمـووی یەکێکی باشتر لە ئەبوبکرو عوسـمان حفصە ئەهێنێ ، وە عوسمانیش یەکێکی باشتر لە حفصە ئەبێ بە چارەنووسی ،عومەر بەم وەرامە تێ گەیشت کە پێغەمبەر خۆی حفصە ئەهێنێ ، وە ئەخۆشیانا هەستاو دەستی پێغەمبەری گوشیی ، وە مژدەی برد بۆ ئەبوبکرو عوسمان ، لەپاشا پێغەمبەر خۆی حفصەی هێنا ، وەأمی کلثومی کچیشی دابە عوسمان •

حفصە ئافرەتێکی جوان نەبوو ، وەزۆر توندو تووڕەش بووە ، هەموو جارێ باوکی پێیووتووە : ڕۆڵە تۆ چاو لەعائشە مەکە ، چونکە نەخۆت ئەبییت بەو ، وە نە باوکیشت ئەگا بە پایەی باوکی ئەو ، پێغەمبەر بە دڵ حەزت لێناکا ، وە لەبەر دڵی من هێناوتی •

بەم کچانی ئەبوبکرو عومەرە کەپێغەمبەر هێنانی ڕێزی هەردوو وەزیرەکەی خۆی گرت ، وەپایەی بەرزکردنەوە ، هەروەک ڕێزی عوسمان و عەلی گرت و پایەی بەرزکردنەوە بەوەی کە دوو کچی خۆی«رقیە»و«ام‌کلثوم»ی‌بەرودوا دا بەعوسمان‌و فاطمەی دا بە علی ، ئەمە هەمووی بۆ قایم کردنی بنیاتی ئەو دەوڵەتەیە کە دای ئەمە زرێنن •

لێرەدا لەگەل ئەم ئامانجانەی کەووتران ، ئامانجێکی ترهەیە لەئامانجەکانی پێشوو کەمتر نی‌یە ئەویش ئەمەیە : لەناو عەرەبا هەر پیاوێك بمردایەو ژنومناڵی زۆری لەپاش بەجێبمایە ، دوای ماوەیەك براو خزمەکانی ، وە ئاشناو ڕۆشناکانی ئەچوونە لای ژنەکەی ، سەر خۆشی‌یان لێئەکرد ، وەکامیان خۆی بەنزیکتر بزانیایە بە مردۆکەی ، بە ژنەکەی ئەووت : من ئامادەم بۆ مارەکردنت ، وە بۆبەخێوکردنی مناڵەکانت لەبەر خاتری باوکیان •

ئنجا زێنەبی کچی خوزەیمەی هێنا کەمێردەکەی لەجەنگی «ئوحود» داکوژرا ، ئەم ژنە لەتێکۆشەران بوو ، تەنانەت لـەبەر باشیی وخزمە تگوزاریی خـۆی پێی ووتراوە:دایکی هەژاران،بەلام دوای دووسێ مانگ ئەم ژنە مردو کۆچی دوایی‌کرد•

ئنجا هیندی هێنا کە مەشهوورە بە «امسلمە»دوای مردنی عبداللهی کوڕی عبد الاسدی مێردی ، ئەم عبداللهیە پوورزای پێغەمبەرو برای شیریی بووە ، ئەم ژنو

مێرده هەردوکیان لەکۆچکەرانن بۆحەبەشە ، وەلە تێکۆشەرانن لەڕێی ئیسلامەتیدا، ئەم ئافرەتە مێردەکەی زۆر خۆش ویستووە ، تەنانەت کاتێک کەمێردەکەی مرد ، ئەبوبکرو عومەر هەریەکە لەلایەکــەوە خوازبێنی کردووە بۆخــۆی ، بــەڵام شووی بە هیچیان نەکردووە ، پێغەمبەر کە چاوی بە «امسلمه»کەوت ، پێیووت : داوابکە لەخوا کە پاداشیخێرت بداتەوە،وە یەکێکت بۆبنێرێ کە جێی خوالێخۆشبووت بۆپڕ بکاتەوە ، امسلمە ووتی : کێ لەعبدالله باشترە ، ئەم وەرامەیە وەدەر ئەکەوێ کە امسلمە تاچەندەخەمبارو دڵبرینداربووە بۆمێردەکەی ، وەپێغەمبەر تێگەیشت کەئەم ئافرتە کۆست کەوتووە بەکەس برینی دڵی ساڕێژ نابێ ، لەبەرئەوە خۆیداوای کرد، امسلمە ووتی : من پیرم و کۆشێک هەتیووم هەیە ، پێغەمبەر فەرمووی : قەیناکا، وە امسلمەی مارە کردو بردیەیە ماڵی خۆی بە هەموو منالەکانییەوە بەخێویکردن ، دیارە ئەم مارە کردنە بۆ هیچ نەبووە تەنها بۆ ڕەزای خوا نەبێ ٠

ئنجا زێنەبی کچی جەحشی هێنا کەپوورزای خۆی بوو ، وەبە فەرمووده‌یخوا و پێغەمبەر مارەکرابوو لەزەیدی کوڕی حارثە،کە بەندەیەکی ئازادکراوی پێغەمبەر بوو وە کردبووی بەکوڕی خۆی ،مارەی کرد دوای ئەوەی کە بەزەید ڕازمی نەبوو ، وە بەدیاری یەوە دانەئەنیشت ، تاناچار بوو بەتەڵاقدانی ٠

ئەم مارەکردنە بۆ دووشت بوو : یەکەم دڵنەوایی دڵی زێنــەب ، کەبــە زۆر درابوو بە زید ، دووهەم بۆ ئەوەبوو کە مسلمانان بزانن کەسێك بکرێ بە کوڕ ، نابێ بە کوڕی ڕاستەقینە ، وە ژنی تەڵاقدراوی ئەو ئەشێ بە زڕباوکەکەی هەروەك ژنی زڕباوکەکەی ئەشێ بەو وەك دووروودرێژ ئەم باسەمان نووسیوە وە تەفسیری ئایەتەکانی سوورەی «احزاب»مان کردووە کە لەم ڕووەوە ئەدوێ ، وە بڵاومان کردۆتەوە لەژمارە ١١ و ١٢ی ساڵی سیهەم‌و ١ و ٢ و ٤ و ٦ی ساڵی چووارەمی گۆڤاری «گەلاوێژ» ١ ، ئەم باسە زۆر گرنگە بچۆ بیخوێنەرەوە ٠

ئنجا جویریەیەی کچی حارثی هێنا ، کە باوکی گەورەو سەرۆکی «بنی مصطلق» بوو ، وە لەغەزای بنی مصطلقدا جویریەیە بە دییل گیرا ،لەگەڵ گەلێ دییلی ترا، وە لە دابەشکردنی غنائمدا ئەم جویریەیەیە بەر ثابتی کوڕی قەیس کەوتبوو ، وە ئەویش لەسەر ئەندازەیەك پارە فرۆتبوویەوە بە جویریەیە خۆی ، پێغەمبەر مارەکەی بۆداو ئازادی کرد ، وە بەرەزامەندیی ئافرەتەکە و باوکی مارەی کرد ، هاوڕێیانی پێغەمبەر کە زانییان پێغەمبەر جویریەیەی ئازاد ، وە مارەی کردووە ،

ئەوانیش هەموو دیلەکانی خۆیانیان ئازاد کرد ، چونکە بوو بوون بە خەزوورانی پێغەمبەر ، بەم هۆیەوە هەموو بنیمصطلق مسلمان بوون ٠

ئنجا امحەبیبەی کچی ابیسفیانی هێنا ، کەژنی عبیداللە کوڕی جەحش بوو ، وە لەگەڵ مێردەکەیا کۆچی کردبوو بۆ حەبەشە ، لە پاشا عبیداللە لە حەبەشە ئەبێ بە گاوور ، دوای ئەوە ئەمرێ ، وە ژنەکەی بە تەنیا ئەمێنێتەوە ، ام حەبیبە نەیئەوێرا بچێتەوە بۆ مەککە لە ترسی باوکی ، لە حەبەشەش کەسێکی نەبوو ئاگاداریی بکات ، دوای ماوەیەك پێغەمبەر کاغەزی نووسی بۆ نجاشی پاشای حەبەشە کە خوازبێنی أم حەبیبەی بۆ بکات ، وە خۆی لە جیاتی ئەم قوبووڵی نکاحەکەی بۆ بکات ، نجاشی لە خێزانی خۆی نافرەتێك ئەنێرێ بۆ لای أم حەبیبە ، کە پێی بڵێ پێغەمبەری ئیسلام داوات ئەکات بۆ خۆی ، أم حەبیبە لەخۆشیانا ئەگەشێتەوە ، وە لە مسلمانەکان خالدی کوڕی سعید ئەکات بە جێنشینی خۆی بۆ مارەکردنی لە پێغەمبەر ، لە پاشا مسلمانەکانی حەبەشە ئەگەڕێنەوە بۆ مەدینە ، وە ام حەبیبە لەگەڵ خۆیان ئەبەنەوە بۆ پێغەمبەر ٠

ئەم ژن هێنانە ، بۆ دڵنەوایی أم حەبیبەو پاداش دانەوەیەتی ، لەسەر ئەو فداکارییانەی کە کردوویەتی ، وە بۆ راکێشانی دڵی ئەبی سفیانی باوکێتی بە لای پێغەمبەرو ئیسلامەتیدا ٠

ئنجا صفیەی کچی حیی ئەهێنێ کە لە جوولەکەی بنی «نضیر» بوو ، باوکی لە جەنگی بنی قریظەدا کوژراو مێردەکەی لە جەنگی خەیبەرا کوژرا ، وە خۆشی بە دیل گیرا ، وە بەر پێغەمبەر کەوت ، پێغەمبەر ئازادی کردو مارەی کرد ، وە بەهۆی ئەم مارەکردنەوە زۆر لە دیلەکانی خەیبەر ئازادکرانو مسلمان بوون ٠

ئنجا مەیموونەی کچی حارثی هێنا لە مەککە لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا ، کە پێغەمبەر لەگەڵ دوو هەزار سوار چووبوو بۆ مەککە بەبێ چەك بۆ عومرەکردن ، وە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ، بەم بۆنەیەوە زۆر لە خزمەکانی مەیموونە مسلمان بوون ، کە یەکێکیان خالدی کوڕی ولیدە کە خوشکەزای مەیموونەیە ، وە ئەمە دواترین ژنێکە کە پێغەمبەر هێناوێتی ٠

ئەم ژنانەی کە پێغەمبەر هێناونی دوای خدیجەو سەودە ، بۆ هەر یەکێکیان هۆیەکی تایبەتی بووە ، بەم ڕەنگە یا ویستوویەتی بەو مارەکردنە پاداشی باوکی ژنەکەی پێبداتەوە ، وەك عائشەی کچی ئەبوبکرو حفصەی کچی عومەری کوڕی

خەتتاب کە دوو پایەی زۆر گەورە بوون بۆ ئیسلامەتی ، هەروەك پاداشی عوسمانو عەلیشی دایەوە بەوەی کە بەرودوا دوو کچی خۆیدا بە عوسمانو کچێکیشی دا بە علی •

وە یا ویستوویەتی پاداشی ژنەکە بداتەوە بەرانبەر بە فداکاری‌یەك کە کردوویەتی ، وە بەرانبەر بەو ڕۆژە ڕەشەی کە لە پێناوی ئیسلامەتی‌دا تووشی بووە ، وەك زێنەبی کچی خوزەیمەو ، امی سلمەو امی حەبیبە •

وە یا ویستوویەتی دڵنەوایی کەس‌وکاری ژنەکەی پێ‌بکاتو ڕایانکێشێ بەلای ئیسلامەتی‌دا ، وەك جویری‌یەی کچی حارثو صفیەی کچی حیی‌و مەیموونەی کچی حارث •

وە یا بۆ تشریعێکی ئایینی بووە ، وەك زێنەبی کچی جەحش •

جگە لەم هۆیانە ، بەم هەموو ژنانەی کە پێغەمبەر هێناونی ، ئنجا بە هەموویان توانیویانە ئەو فەرموودەو فەرمانانەی کە دەربارەی ژنان فەرموویەتی ، وەری‌بگرنو ڕایگەیەنن بە ژنانی مسلمانان ، بەڕاستی هەر یەکێك لەم ژنانە گەلێك فەرموودەی لە پێغەمبەر وەرگرتووە ، کە هەر فەرموودەیەکی سەرچاوەی زانیاری‌یەکە بۆ پیاوانو ژنان •

ئەگەر پێغەمبەر ئەم ژنهێنانانەی هەموو هەر بۆ ئارەزووی دڵ بووایە ، نەیتوانی بگەڕێ بە شوێن چوار کچی زۆر جوانی ناودارو مارەی بکردنایە ، وە ئەم بێوەژنانەی نەهێنایە کە زۆریان پیرو ناشرین بوون ، وە ئەوانیکەی تریشیان یا هەر جوانی‌یان نەبووە ، یا ئەگەر بوویێتیشیان جوانی‌یەکی وا نەبووە کە پیاوێکی وەك پێغەمبەر بجوولێنێ •

جگە لەمانەی کە ووتمان ، ئەبێ ئەمەش بزانین کە پێغەمبەر ـ وەك قورئان لە گەلێ لاوە بلاوی کردۆتەوە ـ ئادەمی‌یەکی خاوەن دڵو هەستو ئارەزوو بووە ، ئەگەر حەزی لە شتێکی جوان کردبێ بە نەنگ ناژمێررێ بۆی ، وە پێچەوانەی پایەی پێغەمبەریەتی نی‌یە ، ئەوی پێچەوانەی پێغەمبەریەتی بێ ، زۆرو ستەمو کاری بێ‌شەرمی‌یە ، کە ئەمانە هیچیان نە لەوا بووە ، وە نە لەهیچ پێغەمبەرێکی‌ترا بووە •

* * *

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ
وَالْحِجَارَةُ، عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ، لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ
وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ (٦) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ

---

**ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ، خۆتانو کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنی‌یەکەی مەردومو بەردە ، بەسەر ئەو ئاگرەوەیە ، چەند فریشتەیەکی دڵڕەقی توندوتیژی وا کە بێ‌فەرمانیی خوا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێ‌ئەدا ، وە چ فەرمانێکیان پێ‌بدرێ ئەیکەن(٦) ئەی ئەوانەی کە بێ‌بڕوا بوون ئەمڕۆ بیانوو مەهێننەوە**

---

**ئنجا با بچینەوە سەر باسەکەی پێشوو کە ئاژاوەکەی ماڵی پێغەمبەر بوو «درووودی خوای‌لێ‌بێ» لەدوای ئەو ڕووداوە گرنگە کەباس‌کرا، وە کاری کردە سەر دڵو دەروونی مسڵمانەکان ـ ئنجا قورئان هاوار ئەکاتە مسڵمانانو بڕواداران کە ئاگایان لە پێویستانی خۆیان بێ بەرانبەر بە ماڵو منداڵو کەسوکاریان ، وە ئەبێ لە بابەت پەروەردەکردنیانەوە هیچ جـۆرە کۆتاهی‌یەکیان نەبێ ، ئەفەرموێ (یا أیها الذین امنوا) ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە (قوا انفسکم واهلیکم) خۆتانو کەسوکارتـان بپارێزن بە ئامۆژگاریی (نارا) لە ئاگرێك کـە (وقودها) سووتەمەنی‌یەکەی (الناس والحجارة) مـەردومی بێ‌بڕواو بەردی کبریتە کە ئەو ئاگرە هەزاران جار لە ئاگری جیهان بەتینترو بەتەووژمترە (علیها ملائکة غلاظ) بەسەر ئەو ئاگرەوەیـە چەند فریشتەیەکی دڵڕەقی (شداد) توندوتییـژیوا کە (لا یعصون الله ما امرهـم) بێ‌فەرمانیی خوا ناکەن لەو شتانەی کە فەرمانیـان پێ‌ئەدا (ویفعلون ما یؤمرون) وە ئەوی پێ‌یان بووترێ ئەیکەنو بەجێی‌دێنن .**

**کەواتە پێویستە لەسەر مسڵمانان کـە خۆشیانو ماڵو منداڵیشیان بپارێزن لەم ئاگری دواڕۆژە ، پێش ئەوەی هەلیان لە دەست بچێ ، وە بیانوو و بەهانەیان لێ‌نەبیسترێ ، نابینیت بێ‌بڕوایان لە ڕۆژی دوایی‌دا ، بەهانە ئەهێننەوە ، کەچی لێ‌یان نابیسترێ ، وەکو ئەفەرموێ (یا ایها الذیـن کفروا) ئەی ئەو کەسانەی کە بێ‌بڕوان (لا تعتذروا الیوم) ئەمڕۆ ـ کە ڕۆژی دوایی‌یە ـ بڕوبیانوو مەهێننەوە ، چونکە ڕۆژی بیانوو نی‌یە ، بەڵکـو ڕۆژی تۆڵەیە لەسەر کردەوەی خۆتـان ، وەکو**

إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٧) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللهِ تَوْبَةً نَصُوحاً، عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ، وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ، يَوْمَ لاَ يُخْزِي اللهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ، نُورُهُمْ يَسْعَى بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا

**تەنها پاداش ئەدرێنەوە لەسەرئەوەی کە کردووتانە(٧) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ، پەشیمان بنەوە بۆ لای خوا بە پەشیمان بوونەوەیەکی ئێجگاریی ، بەڵکو پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆشببێ ، وە بتانخاتە ناو باخاتێکەوە کە ئەڕوا بە بنکیانا جۆگە ئاوی زۆر ، لەڕۆژێکا کە خوا پێغەمبەرو ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە لەگەڵیا ڕیسوایان ناکات ، ڕوناکیی (بڕوا)یان ئەڕوات لە بەردەمیانەوەو لە لای ڕاستیانەوە ، ئەڵێن : ئەی پەروەردگارمان ڕووناکیەکەمان بۆ بگەیەنە بە دوا پلە،**

**ئەفەرموێ ( انما تجزون ما کنتم تعلمون ) تەنها پاداش ئەدرێنەوە لەسەرئەوەی کە کردووتانە لەجیهانا ، باش بە باش‌و خراپ بە خراپ ٠**

**ئنجا با بزانین بڕواداران چۆن ئەبێ خۆیان‌و ماڵ‌و منالیان بپارێزن لەو ئاگری دۆزەخە ؟ وا پێمان ئەڵێ ئەفەرموێ (یا ایها الذین امنوا) ئەی ئەوکەسانەی کە بڕواتان هێناوە (توبوا الی الله) پەشیمان‌بنەوە لە گوناهەکانتان‌و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا (توبة نصوحا) بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاریی ، کە جارێکی‌تر نەچنەوە سەری (عسی ربکم) شایەد کە پەروەردگارتان (ان یکفر عنکم سیئاتکم) دووربخاتەوە لێتان گوناهەکانتان (ویدخلکم جنات) وە بتانخاتە ناو باخاتی بەهەشتەوە ، باخاتێکی وا (تجری مو تحتهـا الانهار) کـە ئـەڕوا بە بنکی درەختەکانیـا جۆگـە ئاوی زۆر ـ بشتانخاتە ناوێوە (یوم لا یخزی الله النبی والذیو آمنوا معه) لە ڕۆژێکا کە خوا پێغەمبەرو ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە لەگەڵیا ، ڕیسوایان ناکات ، واتە نە سزای پێغەمبەر ئەداو ، نـە تکا «شفاعة»یەکی ، ئەگەر ببێ ئەیباتـە دواوە ، ئنجـا لەو ڕۆژەدا (نورهم یسعی بـین ایدیهم) ڕووناکیی بڕواو خواپەرستیـیان ، پێشیان ئەکـەوێ‌و ، ئـەڕوا لەبەردەمیـانو ، لای ڕاسـتیانەوە ، ڕوومو بەهـەشت ، تا ئەیانگەیەنێ بە مەبەست (یقولون ربنا) ئەڵێن : ئەی پەروەردگارمان (اتمم لنا**

نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا، إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(٨)

وە لێمان خۆشبە ، بەڕاستی هەر تۆیت توانا بەسەر هەمووشتێکا(٨)

نورنا) ڕۆشنایی‌مان بۆ بگەیەنە بە دوا پلە (واغفر لنا) وە بمان‌بەخشە ، چونکە (انك علی کل شیء قدیر) بەراستیی هەر تۆیت توانا بەسەر هەمووشتێکا .

بە بۆنەی ئەم ڕووداوەوە کــە لە ناو مالی پێغەمبەرا ڕوویـداوە ، ئەبێ تێبگەین کە مەبەس لەم ئایەتانە چین .

بەلێ هەموو مسلمانێك پێویستە لەسەری ، ڕێ نموونیی مالو منالی خۆی بکات ، وە بە پێی دەسەلات بیروباوەڕو ڕەووشتو خووی خێزانی چاك بکات ، هەروەك پێویستە لەسەری کە خۆی ڕێی ڕاست بـگرێ ، وە دلی خۆی چاك بکات لەگەل خواو بەندەگانا .

بەڕاستی خێزان بەردی بناغەی کۆمەلەو گەلە ، واتە گەل لە یەکەیەکەی خێزان دروست ئەبێ ، ئنجا ئەگەر خێزانەکان خاوەن بیرو باوەڕو ڕەووشتو خووی بەرزو جوان‌بن ، ئەوا ئەو گەلەش بەرزو بلندو یەك بیرو یەك ئامانج ئەبێ ، وە ئەگەر وانەبوو وانابێ .

تاقە خێزانێك وەك قەلایەك وایە بۆ گەل ، قەلا پێویستە قایمو بەتین‌بێ ، هەموو مرۆڤێك لەو قەلایەدا ئەبێ وەك پاسەوانێکی چەك بەدەست وابێ ، کە لە کەلێنێکا وێستابێ ، وە ڕێ نەدا بە مەردومی ناپاك کە لێی بچێتە ژوورەوە ، ئەگینا زۆر بە ئاســانی هەموو ناپاکێك ئەتــوانێ هێرش بەرێتــە ژوورەوە ، وە قەلاکە بگرێ .

لەناو هەمــوو مالو خێزانێــکا ، ئەوەنــدەی باوکی مسلمان پێویســتە ، ئەوەندەش دایکی مسلمان پێویســتە ، تا بە هەردووکیان چاودێریی کــوڕو کچی مالەکە بــکەن ، لەبەرئەوە ئایەتەکانی قورئان وەك یەك هاتوونەتــە خوارەوە بۆ پیاوو ژن ، وە خێزانەکانی ڕێك‌خستووە بە ڕێك‌خستنێکی ئیسلامی ، وە گوناهی خێزانەکانی خستۆتە سەرشانی مسلمانەکان ، هەروەك گوناهی خۆیانی خستۆتە سەرشانی خۆیان ، وەك ئەفەرموێ «یا ایها الذین آمنوا قوا أنفسکم واهلیکم نارا».

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ ، وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ (٩) ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً لِلَّذِينَ كَفَرُوا أمْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ ، كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا ،

---

ئەی پێغەمبەر بجەنگە لەگەڵ بێبروایانو ناپاکانا ، وە توندو (تیـژ) بە لە سەریان، وە (بزانە کە) جێیان دۆزەخە کەجێیەکی زۆر بەدە(٩) خوا بۆبێبروایان ژنی نووحو ژنی لووتی بە میسال هێنایەوە ، کە لە ژێر ( فەرمانی ) دوو بەندەدا بوون لە بەندەگانی باشی ئێمە ، ئنجا ناپاکیـیان لەگەڵ کردن ،

---

لە مەدینە لە کاتی پێغەمبەرا ، دوژمنەکانی ئیسلام دوو جۆربوون ، یەکێکیان بێبروا ، وە لە دەرەوەی مەدینە بوون ، ئەوی تریان ناپاك ، کە هەر بە دیمەن مسلمان ، وە لە ناو شاری مەدینەدا بوون ، ئنجا قورئان فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر بە جەنگین لەگەڵ هەر دوولادا ، ئەفەرموێ (یا ایها النبی) ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (جاهد الکفار) بجەنگە لەگەڵ بێ بروایان کە لە دەرەوە هێرش ئەبەنە سەرتان (والمنافقین) وە لەگەڵ ناپاکان کە لە ناوتانان ، وە بە پەنهانیی هەمیشە کنەتان تیا ئەکەن ، بەم ڕەنگە بجەنگن لەگەڵ یەکەمیانا بە چەك ، وە لەگەڵ دووهەمیانا بە هەڕەشەو گوڕەشە ، یا بە قسەو ئامۆژگاریی (واغلظ علیهم) وە توندوتییژبە لەگەڵیانا (وماواهم جهنم) وە بزانە کە جێگایان دۆزەخە (وبئس المصیر) کە جێگایەکی زۆر بەدو خراپە .

* * *

بە بۆنەی ئەو ڕووداوەی کە لەماڵی پێغەمبەرا ڕوویدا ، وە ئەو گەلەکۆمەکیـیەی لەپێغەمبەر کرا ، ئنجا باسی چەند ژنێکی بێبروا ئەکات لەماڵی چەند پێغەمبەرێکی گەورەدا ، وە چەند ژنێکی بروادار ئەکات لەناوچەیەکی بێبرواییدا ئەفەرموێ (ضرب الله مثلا للذین کفروا امرأة نوح وامرأة لوط) خوا بۆ ئەوانەی کە بێبروابوون ژنی نووحو ژنی لووتی بە میسال هێنایەوە ( کانتا تحت عبدین من عبادنا صالحین) کە لەژێر ڕکێفی دوو بەندەدا بوون لە بەندەکانی باشی ئێمە ( فخانتاهما ) ئنجا ناپاکیـیان لەگەڵ کردن بەم ڕەنگە ژنی نووح بروای

فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللهِ شَيْئاً ، وَقِيلَ: ادْخُلاَ النَّارَ مَعَ
الدَّاخِلِينَ(١٠) وَضَرَبَ اللهُ مَثَلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَونَ إِذْ
قَالَتْ: رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ ، وَنَجِّنِي مِنْ فرعون
وعمله ونجنى من القوم الظالمين (١١)

کەچی ( مێردەکانیان ) نەیانتوانی دووربخەنەوە لێیان شتێك لە سزای خوا ، وە پێیان ووترا کە بچنە ناو ئاگرەوە لەگەڵ ئەوانەی کە ئەچنە ناوێوە(١٠) (هەروا) حوا میسانێکی هێنایەوە بۆئەوانەی کەبڕوایان هێناوە، (بە)ژنی فیرعەون، کاتێك کە ووتی: خوایە بۆم دروست بکە لای‌خۆت خانوویەك لەبەهەشت وە ڕزگارم بکە لەفیرعەونو کردەوەی ، وە ڕزگارم بکە لەگەڵی ستەمکاران(١١)

بە پێغەمبەریەتی مێردەکەی نەهێنا ، وە بە گەلەکەی ئەوت کە نووح شێتە ، وە ژنی لووت جاسووسیی ئەکرد بەسەر مێردەکەیەوە ، وە خەبەری لە میبوانەکانی ئەدا بە گەلەکەی ، وە ئەو دوو پێغەمبەرە گەورەیە ، لەگەڵ ئەو پایەبەرزەدا کە بوویان (فلم یغنیا عنهما) هیچ نەیانتوانی دووربخەنەوە لە ژنەکانیان (من الله شیئا) شتێك لە سزای خوا ، بەڵکو ژنی نووح خنکا بە ئاوو ژنی لووتیش بەردی بەسەرا باریی لەگەڵ گەلەکەیا ( وقیل ادخلا النار ) وە بەم دوو ژنە ووترا لەکاتی مردنیانا لەلایەن خواوە : کە بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە ( مع الداخلین ) لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەی تر کە ئەچنە ناوێوە •

دوای ئەم میسالەی کە هێنایەوە ، کە نزیکیو خزمایەتی بێبڕوا لەگەڵ بڕوادارا ، هیچ قازانجێکی پێنادا ، ئنجا باسی پێچەوانەکەی ئەکات ، کە نزیکیو خزمایەتی بڕوادار لەگەڵ بێبڕوادا ، هیچ زیانێکی پێناگەیەنێ ، ئەفەرموێ ( وضرب‌الله مثلا ) خوا میسالێکی هێنایەوە ( للذین امنوا ) بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ( امرأة فرعون ) بە ژنی فیرعەون کە ئاسیەی کچی موزاحمە ( اذ قالت ) کاتێك کە بێزاریی خۆی لەمێردەکەی دەربڕیو ووتی ( رب ابن لی ) خوایە بۆم دروست بکە ( عندك ) لای خۆت ( بیتا فی الجنة ) خانوویەك لەبەهەشتا ، واتە لە دراوسێتی خۆت جێگایەکم بدەرێ ( ونجنی ) وە ڕزگارم بکە ( من فرعون وعملە ) لەفیرعەونو کردەوەی بەدی ( ونجنی من القوم الظالمین ) وە ڕزگارم بکە لەگەڵی

وَمَرْيَمَ ابْنَةَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا، فَنَفَخْنَا فِيهِ مِنْ رُوحِنَا، وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ (١٢)

وە (بە) مەریەمی کچی عمران ، ئەوەی کە داوێنی خۆی پاراست ، ئنجا فوومان پیاکرد لەلایەن فریشتەی سرووشمانەوە ، وە بڕوای هێنا بە فەرموودەکانی خوای خۆیو نامەکانی ، وە بوو بە یەکێك لە نزاکاران(١٢)

زۆردارانی ستەمکاران •

(ومریم ابنة عمران) واتە هەر بەو ڕەنگە خوا میسالێکی تری هێنایەوە بۆ ئەوانەی کە بـڕوادارن ــ بە مەریـەمی کچی عمـران (التی احضنت فوجها) ئەو مەریەمەی کە داوێنی خۆی پاراستو پیسیی نەکرد ( فنفخنا فیه من روحنا ) ئنجـا فوومان پیا کرد لەلایەن فریشتەی سرووشمانەوە کە جبریلە ، وە لەو فووەوە عیسا پەیدابوو •

ئەمە باسی داوێنپاکیی مەریەم بوو ، ئنجا باسی بڕواو خواپەرستی ئەکات ، ئەفەرموێ (وصدقت بکلمـات ربها وکتبه) مەریەم بڕوای هێنا بـە فەرموودەکانی پەروەردگاری خـۆیو ئەو نامانـەی کە ناردوویەتـە خوارەوە ، کـە یەکێکیان ئینجیلی عیسـایە (وکانت من القانتـین) وە بـوو بـە یەکێك لـە خواپەرستانی نزاکاران •

واتە هەمووکەسـێك بەرپرسیار «مسئول»ە لە کردەوەی خـۆی ، وە هیچ کەسێك لە کرداری خراپی خۆی ڕزگاری نابێ با خزمی پێغەمبەریش‌بێ ، هەروەك زیانی پێ‌ناگەیەنێ خزمایەتی پیاوخراپان ئەگەر خۆی باش‌بێ •

لەم باسی ژنانەدا پلاری تیایە بۆ حفصەو عائشەی خێزانی پێغەمبەر ، وە هەڕەشەی تیایە بۆیان لەسەر ئەوەی کە حفصە نهێنی پێغەمبەری بردە دەرەوە ، وە لەسەر ئەو گەلەکۆمەکیـیەی کـە کردیان لەسـەر پێغەمبـەر ، وە دڵی پیرۆزیان ئازاردا ، وە جڵەوگیری‌یان ئەکات لەوەی کە جارێکی‌تر کارێکی وابکەن ، چونکە با ژنی پێغەمبەرو کچی ئەبوبکرو عمریش‌بن ، کە گوناهێکیان کرد ، خوا لەبەر ئەوان لێیان خۆش‌نابێ ، هەروەك لە ژنی «نووح»و «لـووت» خۆش نەبوو لەبەر خاتری مێردەکانیان ، دووبارە لـەم باسەدا بەتایبەتی سەرکۆنەی تیایە بـۆ حفصە کە

نهێنی پێغەمبەری بردە دەرەوە ، وەك ژنی لووت پێغەمبەر کە جاسووسیی بەسەر مێردەکەیەوە ئەکرد ، وە نهێنی ماڵی لووتی ئەبردە دەرەوە بۆ بێبڕواکان ٠

بەیارمەتی خوا لە تەفسیری ئەم جزمە بوومەوە لە ڕۆژی ١٨/٨/ ١٣٩٠ بە ڕێکەوتی ١٨/١٠/١٩٧٠ لە شاری سلێمانی ، خوا بیپارێزی لە هەموو ئاژاوەو ناخۆشی‌یەك ٠

## نـــــــاوەرۆك


۳ سوورەی «مجادلە»
٤ باسی ئەحکامی ظهار
۸ باسی چرپەی ناپاکان .
۱۰ باسی سلاوی جوولەکەکان لە پێغەمبەر بە ڕەنگێك کە جنێو بگەیەنێ .
۱۱ جلەوگیریی مسلمانان لە چرپەچرپ .
۱۲ فەرماندان بە تەکەکردن بۆ ئەوانەی کە جێگای دانیشتنیان نیەیە لە کۆڕێکا .
۱۳ باسی جلەوگیریی مسلمانانو ناپاکان لە چرپەکردن لەگەل پێغەمبەرا تا خێرێك لە پێشەوە نەکەن .
۱۵ باسی ئەو ناپاکانەی کە دۆستایەتی ئەکەن لەگەل جوولەکەدا ، وە نهێنی مسلمانانیان پێ ئەلێن .
۱۸ باسی ئەو ناپاکانەی کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەر ئەکەن .
۱۹ بڕوا بە خواو دۆستایەتی دوژمنانی خوا کۆنابنەوە لە دلێکا .
۲۲ سوورەی «حشر»
۲۳ باسی پەیمانشکاندنی «بنی النضیر»و دەرکردنیان لەلایەن پێغەمبەرەوە .
۲۸ تەعریفی «فیء»و «غنیمە»و لەیەك جیاکردنەوەیان .
۲۸ باسی دابەشکـــردنی ئەو مالەی کە جوولەکەکانی بنی النضـــیر بەجێیان هێشت .
۲۹ دەستووری ڕێکخستنی ئابووریی لە ئیسلاما .
۳۰ دەستووری وەرگرتنی شەریعەت لەیەك سەرچاوەوە کە خوایە .
۳۱ مدحی کۆچکەران .
۳٤ مدحی یارمەتیدەران .
۳۵ بەلێندانی ناپاکەکان بە جوولەکەو پەشیمان بوونەوەیان .
۳۸ ڕووداوی بنی قینقاع .

٤١ تینو تەووژمی قورئان لەسەر دڵان

٤٤ ئەوەدو بۆ ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە ٠

٤٥ **سوورەی « ممتحنە » ٠**

٤٥ کردەوە ناشیرینەکەی حاطبی کوڕی بەلتەعە ٠

٤٨ فەرماندان بە هاوڕێکانی پێغەمبەر بە پەیڕەویی کردنی حەزرەتی ئیبراهیمو هاوڕێکانی ٠

٥٣ ڕێکەوتنامەی حدیبیە ٠

٥٦ کۆچی ژنانو پەیمانبەستنیان لەگەڵ پێغەمبەرا ٠

٥٩ **سوورەی « صف »**

٦٠ خۆشەویستترینی کردەوە لای خوا ٠

٦٢ ناوبردنی پێغەمبەر بە احمد لە ئینجیلی یوحەنا لە فەسلی پانزەدا ٠

٦٢ چوونی جوولەکە بە گژ ئیسلاما لە یەکەم ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ ٠

٦٤ چرایەك کە خوا هەڵی گیرسێنێ چۆن بەفوو ئەکوژێتەوە ٠

٦٥ لەماوەیەکی زۆر کەما ڕووناکیی ئیسلام بەشی زۆری سەرزەویی ڕووناك کردەوە ٠

٦٦ جەنگ لەڕێی خوادا بە گەلێ جۆر ئەبێ ٠

٦٧ مزگێنیدان بەگرتنی شاری مەککە ٠

٦٩ **سوورەی « جمعە » ٠**

٧١ باسی ڕەووشتو خووی عەرەب لەپێش ئیسلامو دوای ئیسلام ٠

٧٣ باسی مباهلە ٠

٧٥ باسی فەلسەفەی جمعەو دوانەکەی ٠

٧٨ **سوورەی «منافقون» ٠**

٧٩ باسی سوێندی درۆی ناپاکان ٠

٨٠ تەعریفی ڕاستو درۆ ٠

٨٢ باسی سەرۆکی ناپاکان کە ووتی کە گەڕاینەوە بۆ مدینە ، ئەبێ کۆچکەران دەرکەین ٠

٨٥ ئەوەی کە عبداللّەی کوڕی عبداللّەی ئوبەی کردی بە باوکی ٠

| | |
|---|---|
| ٨٦ | جڵەوگیریی مسڵمانان لەوەی کە ماڵو منال خەریکیان بکەن لە خوا • |
| ٨٨ | **سوورەی « تغابن » •** |
| ٩٤ | هەرچی تووشی ئادەمیی ببێ بەپێی دەستوورو باوی خوایە • |
| ٩٥ | زۆر لە ژنو ماڵو منال دوژمنی پیاوون ، ئەبێ پیاو ئاگای لە خۆی بێ |
| ٩٨ | **سوورەی « تەلاق »** |
| ٩٨ | تەلاق ئەبێ یا لەپاکیەکا بێ کە بۆ ژن حساب بکرێ ، وەیا لەکاتی سك‌پڕیی‌دابێ • |
| ٩٩ | تەلاق لای هەر چوارپێشەواکە لەهەموو کاتێکا ئەکەوێ • |
| ١٠٠ | ژنی تەلاقدراو لە ماوەی عیدەدا لە ماڵی مێرد دەرناکرێ ، هەروەك خۆی نابێ بچێتە دەرەوە • |
| ١٠٢ | **پیاو کە ژنی تەلاقدا ، یا پەشیمان بووەوەو بردیەوە یا دو شاهیدی لەسەر بگرێ •** |
| ١٠٥ | عیدەی ژنێك کە هێشتا حەیزی پیا نەهاتبێ لەگەڵ ژنێك کە لەحەیز وێستابێتەوە • |
| ١٠٥ | باسی عیدەی سك‌پڕ • |
| ١٠٧ | باسی نفقەی ژنێکی سکپڕ کە تەلاقدرابێ • |
| ١٠٧ | باسی ژنی تەلاقدراو کە شیر بدا بە منالەکەی • |
| ١٠٧ | باوك‌ودایك‌ئەبێ ناوبەناو ڕاوێژبکەن لەبابەت کاروباری منالەکەیانەوە |
| ١٠٧ | باسی دایەن‌گرتن • |
| ١٠٨ | ئەو ئەندازەیەی کە پێویستە لە نفقەدا • |
| ١١١ | باسی زەوی کە ئەستێرەیەکە وەك ئەستێرە گەڕۆکەکانی‌تر . |
| ١١٥ | **سوورەی «تحریم»** |
| ١١٥ | حەرام‌کردنی ماری‌یەی قبطی لەلایەن پێغەمبەرەوە • |
| ١١٥ | تەلاقدانی حفصە لەلایەن پێغەمبەرەوە • |
| ١١٩ | باسێکی ئادەمێتی پێغەمبەر • |
| ١٢٠ | باسێکی هاوسەرانی پێغەمبەر • |
| ١٢٠ | باسی خدیجەی کچی خووەیلد • |

١٢١ باسی سەودەی کچی زەمعە ٠
١٢١ باسی عائشەی کچی ئەبیبکر ٠
١٢١ باسی عائیشەی کچی ئەبیبکر ٠
١٢٢ باسی زینبی کچی خوزیمە ٠
١٢٢ باسی ام سلمە ٠
١٢٣ باسی زینەبی کچی جەحش ٠
١٢٣ باسی جووەیرییەی کچی حارث ٠
١٢٤ باسی ام حبیبەی کچی ئەبیسفیان
١٢٤ باسی صفیەی کچی حویەی ٠
١٢٤ باسی مەیموونەی کچی حارث ٠
١٠٤ فەلسەفەی هێنانی هەریەکێك لەم ژنانە ٠
١٢٦ باسی ئامۆژگاریی ماڵو منالو پەروەردەکردنیان بە باشی ٠
١٢٨ گرنگیی خێزان لە ئیسلاما ٠
١٢٩ باسێکی ژنی نوحو لوط پێغەمبەر ٠
١٣٠ باسێکی ئاسیەی ژنی فیرعەون
١٣١ باسێکی مەریەمی کچی عمران ٠

## تێبینی

تکایە لەپێش خوێندنەوەدا ئەم هەڵانە چاك بكەن

| لاپەڕە | دێـڕ | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ١ ـ | ٦ ـ | جزمی هەشتەم | جزمی بیستو هەشتەم |
| ١٣ ـ | ٤ ـ | پییان | پێتان |
| ١٧ ـ | ٢٩ـ | جنة) | ایمانهم جنة) |
| ٢٠ ـ | ٢٥ـ | پشتیوانی | پشتیوانیی |
| ٢٩ ـ | ٢٦ـ | رێی‌ی | ڕێ‌ی |
| ٢٩ ـ | ٢٧ـ | مسلمانانا | مسلمانان |
| ٤١ ـ | ٢٣ـ | ئەم قورئانانەمان | ئەم قورئانەمان |
| ٤٢ ـ | ١١ـ | پیرۆزی | پیرۆزی |
| ٤٦ ـ | ٢٤ـ | دوزمیانە | دوژمنانە |
| ٤٨ ـ | ٨ ـ | | ئەگەر بۆتان بە کوشتنو بڕین (وانسنتهم بانسوء) وە زبانیان درێژ |
| ٤٨ ـ | ١٢ـ | ناکەوی ل | ناکەوی لە |
| ٥٠ ـ | ٩ ـ | بەیەیروی | پەیرەویی |
| ٥٨ ـ | ٩ ـ | دویی | دوایی |
| ٦٤ ـ | ١٤ـ | ستەمدارر | ستەمکار |
| ٦٥ ـ | ١٢ـ | ئەمیتەوە | ئەکرێتەوە |
| ٧٥ ـ | ١٦ـ | (و.و البیع) | (وذروا البیع) |
| ٧٧ ـ | ٩ ـ | (قاىما) | (قائما) |
| ٨٠ ـ | ٢٧ـ | نێ ناگەن | |
| ٨١ ـ | ١٧ـ | جیاوازیان | جیاوازییان |
| ٨١ ـ | ٢٧ـ | (فاحزرهم) | (فاحذرهم) |
| ٨٤ ـ | ١٠ـ | مەدینە | مەککە |
| ٨٨ ـ | ١٥ـ | خال | حال |
| ٨٩ ـ | ١٧ـ | پنکی | پێکی |
| ٨٩ ـ | ١٩ـ | فاىسن | فاحسن |
| ٩٦ ـ | ١٠ـ | (ف حذرهم) | (فاحذروهم) |

| لاپەڕە | دێـر | چەوت | ڕاست |
| --- | --- | --- | --- |
| ٩٦ ـ | ٢٥ـ | پێنغەمبەر | پێغەمبەر |
| ـ١٠٦ـ | ٢١ـ | لە خانوویەکی وادا | لە خانوویـەکی وادا دایـانبنێن (ولا تضاروهن) وە ئازاریان پێمەگەیەنن ، نە لە جێگاوریگایانا ، نە لە |
| ـ١٠٦ـ | ٢٤ـ | | ئەم دێڕو نیوە تەکرارە |
| ـ١٠٧ـ | ١١ـ | درنژ | درێژو |
| ـ١٠٨ـ | ٥ ـ | دەولەند | دەولەمەند |
| ـ١١٤ـ | ٢١ـ | بەچێ | بەجێ |
| ـ١١٤ـ | ٢٢ـ | خۆپا پەشیمان | خۆیا پەشیمان |
| ـ١١٤ـ | ٢٣ـ | حەفعە | حەفصەی |
| ـ١١٧ـ | ١٦ـ | ان تتوبی | ان تتوبا |
| ـ١١٨ـ | ٢ ـ | مؤسنات | مؤمنات |
| ـ١٢٣ـ | ٢٧ـ | مارەکەی | پارەکەی |
| ـ١٢٦ـ | ١ ـ | نارڕا | نارا |
| ـ١٢٧ـ | ١٢ـ | تعلمون | تعملون |

لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە ١٦٦٥ی ساڵی ١٩٨١ی دراوەتێ

لەم تەفسیرەدا

هەموو لاپەڕەیەك چەندەی قورئان پەربکەوێ ، ئەوەندە لە سەری لاپەڕەکەوە نوسراوە ، ئنجا خەتێك کێشراوە ، وە وەرگێڕراو «تەرجەمە»کەی لەژێرا نوسراوە، دوای ئەوە خەتێکی تر کێشراوەو تەفسیرەکەی نوسراوە ٠

هەموو ئایەتێـك سەرەتایەکی وای بـۆ نوسراوە کە مەبەس لـە ئایەتەکە ڕوونبکاتەوە ، بەجۆرێکی وا کە هەموو خوێندەوارێك تێبگات کە چی ئەفەرموێ، وە پەیوەستیی چیـیە لەگەڵ ئایەتی پێشوودا ٠

لە هەمووی جوانتر ئەوەیە کە تەفسیرەکە لەگەڵ قورئانەکەدا جۆشدراوە ، هەروەك تەفسـیرەکە خۆی لەگەڵ خۆیـا جۆشدراوە ، لەگـەڵ ئەمیشـە کە بە کوردییەکی پەتی ڕەوانی وا نوسراوە کە هەموو کەسێك تێی بگات ٠

جا کەوابوو ئـەی کوردی مەرد تەفسیری قورئانە پیرۆزەکەت بـە ووردیی بخوێنیتەوەو دڵی بـۆ بکەرەوە ، وە تا تەفسیری ئەم جزمە ئەخوێنیتـەوە ـ خوا یاربێ ـ جزمێکی ترت بۆ لەچاپ ئەدرێ ، وە جزم بە جزم پێشکەشت ئەکرێ ٠

نرخی (٩٠٠) فلسە

لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە ١٦٦٥ی ساڵی ١٩٨١ی دراوەتێ

لە بەڕێوەبەرێتی چاپخانەی زانکۆی صلاح‌الدین چاپکراوە